# کوردان

# لەژێر داگیرکاریی فەرەنسا

د.خالید عیسا
و. لەعەرەبییەوە: سەلام عەبدولکەریم

چاپی یەکەم
سلێمانی /2010

پێڕست

کوردان لەژێر داگیرکاری فەرەنسا. (1)
ڕاپەڕینی ئیبراهیم هەنانو. (17)
داگیرکردنی ناوچەی جەزیرە. (21)
چوارەم: ڕاپەڕینی ساڵانی سیەکان. (30)
ڕاپەڕینەکانی ناوچەی(جبل الاكراد). (33)
ڕاپەڕین بۆسەرخستنی ئاگری(شۆڕشی ئاگری (41)
ڕاپەڕینی سەعید ئاغای دەقوری. (44)
**پێنجەم:** ساڵەکانی ژانگرتن. (50)
پەرتەوازەیی کورد . (51)
هەڵوێستی کوردانی دەرەوەی کوردستان. (55)
یەکەم: تەوژمی شیوعیەت. (55)
دوەم: تەوژمی نەتەوەیی عەرەبی. (56)
1 کۆمەڵەی کاری نەتەوەیی. (57)
2-کوتلەی نیشتمانی. (57)
حزبی نەتەوەیی سوریا. (58)
بزوتنەوەی بەعسی عەرەبی. (58)
ئەلف- تەوژمی لیبراڵی. (60)
بێ- تەوژمی نەتەوەیی ڕەگەزپەرستی. (60)
جیم- تەوژمی چاکسازی. (61)
سێیەم: تەوژمی ئیسلامی. (62)
بوژانەوەی هزری نەتەوایەتی کورد. (66)
پەراوێزو سەرچاوەکان. (75)

ئـــەم وەرگێڕانـــە پێشـــکەشـــە بـــەگیانی قـــەدری بـــەگ جـــەمیل پاشـــا، کاتێـــك داوای لێکـــرا ببێتـــە نۆکـــەرو بەکرێگیراوی فەرەنسیەکان، مەردانە وتی:

"چـــۆن دەتـــوانم ڕێگـــە بـــەخۆم بـــدەم هاوکـــاری حکومـــەتێکی بیـــانی بکـــەم، کـــە وڵاتەکـــەمی داگیرکردوە".

# لەبارەی د.خالید عیساو ئـەم وەرگێڕانەوە

سوپاس‌و ستایشی خوای گـەورە دەکـەم، کـە تائـەم ساتەوەختە تەمـەن‌و دەرفـەتی پێبەخشـیم بۆئـەوەی بتـوانم ئـەمجارەش بەرهـەمێکی تـر وەك ئـەرکێکی ئـاینی‌و نەتـەوەیی پێشکەشـی میللەتەکـەم بکـەم، داواکـارم هاوکـارو یارمەتیـدەرمان بێـت بۆزیـاتر خزمەتکردن‌و ناسـاندنی قۆناغـە جیاوازەکـانی مێـژوی نەتەوەکەمان‌و ئاشناکردنی بەنەوەکانمان.

بەر لەوەی باسی ئەم بەرهەمە بکـەین، بەپێویسـتی دەزانم قسە لەسـەر نوسـەری بابەتە بکەم، کەئەویش د.خالید عیسایە. ئێمە کاتێك لێکۆڵینەوەیەك دەنوسین یـاخود نوسـینێك وەردەگێـڕین، زۆرجـار لـەو خاڵـەوە دەسـتپێدەکەین‌و دەڵێـین هـەمو مرۆڤێـك قـەرزێکی نەتـەوەیی لەسـەر شـانەو پێویسـتە بەرامبـەر بەنەتەوەکـەی بیداتـەوە، بـەڵام ئـەی ئەگـەر مرۆڤێـك لەنەتەوەیـەکی تـر بێـت، کـەچی بەشـێکی گـەورەو بـەنرخی ژیـانی زانسـتی‌و ئـەکادیمی خـۆی بـۆ خزمەتکردنی نەتەوەیەکی تر تەرخان کردبێـت، دەبـێ ئەمە ناو بنێین چی؟

د.خالید عیسا ئەو مرۆڤە لەخۆبردوەیـە، کـە لەرێگـەی نوسین‌و کۆششـە زانسـتی‌و روناکبیریەکانیـەوە جگـە

لەوەی کتێبخانەی کوردی ئێمـەی دەوڵەمەنـد کـردوە، هاوکــات قەرزارباریشـــی کــردوین، لــەوەدا بــەدەیان نوسـینی زانستی لەبارەی قۆناغە گرنگەکانی مێـژوی نەتەوەکــەمانو بەتایبــەتیش دەربــارەی پارچەیــەك لەکوردســـــتانی گـــەورەی دابەشـــــکراو(رۆژئـــاوای کوردســـتان) پێشکەشـــکردوە. هـــەروەها چەنـــدین بەڵگەنامەی گرنگیشـی لەسـەر جوڵانـەوەو شۆڕشـە نەتەوەییەکانی کورد بڵاوکردۆتەوە.
د.خالیـــد عیســـا هەرچەنـــدە بەرەگـــەزو رەچەڵـــەك لەنەتــەوەی عەرەبــە، بــەڵام پڕواناکــەم کــەم کــەس لەمیللــەتی کــورد بەتایبــەت لەکەســانی ئــەکادیمیو روناکبیران، هێندەی ئەم مرۆڤە میهرەبانەو بەو میتـۆدو شـێوازە زانسـتیە، خزمـەتی مێـژوی کـوردی کردبێـت، بەشــبەحاڵی خــۆم هەرچەنـد ســەر دەهێـنمو ســەر دەبەم ناتوانم پەی بەو نهێنیە بەرم، کـە لەپشــتەوەی ئەم هەوڵە بەنرخانەی د.خالیدەوە خۆیان حەشاردراوە، بەتەنها سـەیرکردنێکی ماڵپـەڕی(گـەلگامێش) بەسـە بۆئــەوەی لەمــەزنیو گــەورەیی ئــەم پیــاوە تێبگــەین، چونکـە بەشــی مێـژوی ئـەم ماڵپـەڕە پـڕن لەنوسـینە جوانو بەپێزەکانی ئـەم مرۆڤـە سـەنگینە. رەنگـە مـن تەنها ئەوە لەبارەوە بڵێم، کـە د.خالیـد عیسـا یـەکێك لــەو ملیۆنــان مرۆڤــەی نەتــەوەی عەرەبــە، کەبــەر لەمردنی ویژدانی خۆی ئاسـودە کـردوەو لـەو ویژدانـە بریندارەی نەتەوەی عـەرەب دێتە دەرەوە.

بەرهـەحاڵ هـەرچی بلێـین پڕواناکـەم بتـوانین مـافی خۆی بەد.خالیدو بەرهەمە جوانەکانیشـی بدەین. بۆیە پەیوەندی من بەم نوسـینەوە بۆئەو کاتـە دەگەڕێتـەوە، کەبۆ هەندێ نوسـینی ئەکادیمی دەگەڕام، بۆیە کاتێك ئــەم نوســـینەی د.خالیــد عیســـام بـــەرچاو کـــەوت بەناونیشـانی(الاکراد تحت الانتداب الفرنسـی) لـەپێنج ئەڵقەی سـەربەخۆ پێکهـاتبو، تێبینـی ئـەوەم کـرد، کـە لەچەنـد رویەکـەوە گرنگـە، بەتایبـەت بەشـێوەیەکی زانسـتی نوسـراوەو لەولاشـەوە دەربـارەی بـارودۆخی رۆژئـاوای کوردسـتانە(ئـەوەی نازانسـتیانەو نامێژویانـە نـــاوی نـــراوە کوردســـتانی ســـوریا) لـــەو قۆناغـــە هەســـتیارەدا، کـــە بـــەزمانی کـــوردی‌و لەکتێبخانـــەی کوردیـــدا نوســـینی کـــەمی لـــەبارەوە هەیـــە. بۆیـــە بەئەرکێکی ئاینی‌و نەتـەوەیی‌و زانسـتی خـۆم زانـی، ئـەو خزمەتـەی نـاوبراو پێشـکەشـی ئێمـەی کـردوە، منیش ئەو ئەرکە بخەمە بـەر خـۆمو بـەزمانی کـوردی بۆخوێنـــدکاران‌و قوتابیـــان‌و خوێنـــەوارانی کـــوردی وەربگێڕم. هاوکات وەك پاداشـتێکیش بـۆرێزدار(د.خالیـد عیسا) لای خۆمەوە ئەو بەڵێنـەم داوە، کـە بـەگوێرەی توانـــاو دەرفـــەت هـــەرچیم پێبکرێـــت دەســـتبدەمە وەرگێـڕان‌و بـەکوردی کردنـی هـەمو ئـەو بەرهـەمو نوســـینانەی نـــاوبراو، کـــەدەربارەی مێـــژوی کـــوردو جوڵانـەوەی رزگـاریخوازی نەتەوایـەتی میللەتەکـەمان لەسـەردەمانی رابرودا نوسـیویەتی‌و ئامـادەی کـردوە. بۆیـــە لێرەشـــەوە ئـــەو مژدەیـــە بەخوێنـــەرانی

بەرهەمـــەکانم دەدەم، کـــە لەئێســـتا ســـەرقاڵی وەرگێڕانــی بەرهــەمی دوەمــی نوســەری پایەبــەرز( د.خالید عیسا)م، بەناونیشانی( دەربارەی جوڵانەوەی کـورد لەبەڵگەنامـەکانی فەرەنسـا)، کەبریتیـە لـە(76 ئەڵقــە)و تایبەتــە بــەبارودۆخی ناوچــەکانی بــاکورو رۆژئــاوای کوردســتانو جوڵانــەوەی نەتــەوەیی کــورد لەســەروبەندی هاتنەســەر کــاری مســتەفا کــەمال ئــەتاتورك. بۆیـە ئەگـەر خـودا هاوکـارو یارمەتیـدەرمان بێــت، ئــەوا لەداهاتویــەکی نزیکــدا پێشکەشـــی کتێبخانەی کوردی دەکەین. هاوکات پێویستە ئـەوەش بڵـێم ئێمـە لەبەرامبـەر وشـەی(الانتـداب)دا وشــەی (داگیرکـــاری) کوردیمـــان بـــەکارهێناوە، هەرچەنـــدە وشـــەی ئینتیـــداب راســـتەوخۆ بـــەمانای داگیرکـــاری نایــەت، بــەڵکو بــەمانای دەســەڵاتی وڵاتــیٚ َك یــان دەوڵـەتێك بەسـەر دەوڵـەت یـان وڵاتێکـی تـرەوە دێـت لـەروی یاسـاییو دەسـتوریەوە، بـەڵام زلهێنـانی ئـەو سـەردەمە بەتایبـەت بـەریتانیاو فەرەنسـا کـات َێـك وڵاتێکیـــان داگیردەکـــرد بۆمانـــەوەی شـــەرعیەتی داگیرکـاری خۆیـان بەسـەریانەوە، دەهـاتن وشـەی ئینتیـدابیان بـەکاردەهێناو لەرێگـەی بەنـدە یاسـاییو دەسـتوریەکانەوە داگیرکـاری خۆیـان دەکـردە کـارێکی رەواو مەشروع.

لێرەشەوە ئەوە بەخوێنەرانی ئـەم بەرهەمـەو تـەواوی بەرهەمەکانیترم دەکەم، کـە لـەمبارەوە هـەر رەخنـەو سـەرنجو تێبینیەکیان هەیە بەسـنگێکی فـراڵو ڕێـزەوە

لێیان قبوڵ دەکەمو دەتوانن لەرێگەی ئەو ئیمەیلەی خوارەوە بۆم رەوانە بکەم. بۆیە دوبارە سوپاسی بێپایانی خودای گەورە دەکەم، کەئەم تەمەنو دەرفەتەی پێبەخشیم بۆئەوەی بتوانم خزمەتێکی زانستی نەوەکانی میللەتەکەم بکەمو تەنها بەوەش دڵخۆشم، کەئەگەر توانیبێتم لەرێگەی بەرهەمەکانمەوە خزمەتێکم بەمێژوی نەتەوەکەم کرد بێت، بۆیە جگە لای خودا چاوەڕێی هیچ پاداشتێك لەهیچ کەسو لایەنێك ناکەم.

سەلام عەبدولکەریم
ماستەر لەمێژوی نوێی هاوچەرخ
زانکۆی سلێمانی
Salam_80jornalist@yahoo.com

# کوردان لەژێر داگیرکاری فەرەنسا

(1)

کـــــوردانـــــــی نەتـــــەوەیی لەکوردســـــــتانی باکور(تورکیا)،(راسـتەکەی باکوری کوردسـتان- و.ك) لـــەنێوان داواکردنـــــی ئۆتۆنـــــۆمیو داواکردنـــــی ســـەربەخۆییدا دابەشـــبون، هـــیچ یـــەکێك لـــەو دو تەوژمەش نەیتوانیوە ئەوەی داوای دەکات، بەدەستی بهێنێـــت. مســـــتەفا کـــەمال تـــوانی ناتورکـــەکان لـــە فەرمانڕەوایـــەتی دوربخاتـــەوە، لەکاتێکـــدا جوڵانـــەوەی کـــورد لەهـــــەردو بەشـــــی باشـــــورو رۆژهـــــەڵاتی کوردستان(عێراق‌و ئێران) زیاتر کارابو. شێخ مەحمودی بـــــەرزنجی(1878-1956) ملکـــــەچکردنی ناوچـــــە کوردیـەکانی بـۆژێر دەسـەڵاتی داگیرکـاری ئینگلیـزی لەعێراقدا لەسەروبەندی جـەنگی یەکـەمی جیهانیـدا رەتکـــردەوە، کـــاتێکیش ئینگلیـــز هەوڵیـــدا نفـــوزی لەکوردســـتان کەمبکاتـــەوە، شـــێخ مـــەحمود چـــەکی لـــەڕوی ئینگلیـــز لـــەرۆژی(1919/5/21) بـــەرزکردەوە. هێزەکانی ئینگلیـز توانیـان لـەسـەروبەندی جـەنگێکی خوێناویدا لەنزیك بازیـان لـەرۆژی(1919/6/9ز) بەسـەر ناوچەکانی کوردستاندا زاڵبن، بـەڵام لەسـاڵی(1922) بـــەهۆی هاتنـــەئارای گۆڕانکـــاری لەسیاســـەتی

هەرێمایەتی ئینگلیزەکان رازیبون لەسەر دامەزراندنی یەکەیەکی سیاسی بۆکوردو شێخ مەحمودیش گەڕایەوە بۆسلێمانی، بۆئەوەی خۆی وەك مەلیکی کوردستان رابگەیەنێ. هاوکات شێخ مەحمود شاری سلێمانی کردە پایتەختی شانشینەکەی‌و حکومەتێکی لەهەشت وەزارەت پێکهێناو هەردو حکومەتی عێراق‌و بەریتانیاش لەرۆژی(22ی کانونی یەکەمی (1911)(1) دانیان پێدانا. ئەم شانشینە تاوەکو مانگی حوزەیرانی ساڵی(1924) مایەوە، کاتێك هێزەکانی عێراق بەکۆمەکی هێزە ئاسمانیەکانی بەریتانیا بەرەو کوردستان بۆلەنێوبردنی ئەو دەوڵەتە کوردیە تازەپێشگەیشتوە کشان، بەڵام لەرۆژهەڵاتی کوردستان سمایل ئاغای شکاك توانی لەساڵی(1920 تاوەکو1930) بەسەر زۆربەی هەرێمە کوردیەکان لەئێراندا زاڵببێ‌و داوای سەربەخۆیی هەمو کوردستانی دەکرد.(2) لەسەرەتای جەنگی یەکەمی جیهانیداو بەشێوەیەکی وردتر لەرۆژی(16ی حوزەیرانی 1920)، ئەمین عەلی بەدرخان سەرۆکی باڵی سەربەخۆیی کورد لەوکاتەدا یاداشتنامەیەکی پێشکەشی کۆمیسیۆنی گشتی فەرەنسا لەئەستەمبوڵ کردو تیایدا وتی:"نفوزو لایەنگری زۆرمان لەکوردستان هەیە، بەتایبەت لەو بەشەی کە دەکەوێتە ژێر داگیرکاری فەرەنساوە"،(3) هەروەها وتی:"ئەو نفوزەی کەحکومەکەتان دەتوانێت بەکاری بهێنێت لەپێناوی گەیشتن بەو ئامانجە، هیچ نیە جگە

لەگرەنتی ئاشتی لەهـەمو ئـەو وڵاتـەی، کەدەسـتی بەسـەردا گرتوە".(4)
لـــــەرۆژی(1920/7/23) ســـــوپای فەرەنســـــا بەسـەرکردایەتی جـەنراڵ غـۆرۆ شـاری دیمەشـقیان داگیرکردو ناوبراو لەرۆژی دوەمدا رۆیشتە سـەر گـۆڕی سەلاحەدینی ئەیوبی لەمزگەوتی ئومەوی، بۆئـەوەی پێـی بڵێـت:"وا ئێمـە گەڕاینـەوە ئـەی سـەلاحەدین"، ئەمـــەش کاردانەوەیـــەك بـــو لەســـەر قســـەکەی سەلاحەدین، کەپێشـتر بەخاچپەرسـتانی وتبـو:"ئێـوە لەرۆژهەڵات دەرچون، ناگەڕێنەوە بـۆی".(5) وتارەکـەی جەنراڵ غۆرۆ هەستی کوردانی برینـدارکرد، بەتایبـەت سـەرۆك هۆزەکـانو زۆرینـەی مسـوڵمانان. ئـەم وتـارە ترسـی سـەرکردە ناوچەییـەکانی کـوردی بـەهێزکرد لەونکردنو لەدەستدانی دەسـەڵاتو نفوزیـان لـەنێوان دانیشـتواندا، ئەگـەر هـاتو دەوڵـەتێکی بـەهێزی وەك فەرەنســـا جڵـــەوی کاروبارەکـــان بگرێتـــە دەســـتو سیاسـەتێکی مەرکەزی لەفەرمانڕەوایەتیدا بگرێتەبـەر. گرتنەبـــەری رێو شـــوێنەکانی دیـــاریکردنی ســـنور لەنێوان فەرەنسـاو تـورکو ئینگلیـزدا تـوڕەیی کـوردانی وروژانـــد. ئەوانـــەی کـــە لەدامەزرانـــدنی ســـنورو دیاریکردنیـدا هەسـتیان بـەزیان دەکـرد، بـەکرداریش دەبـوە هـۆی دابەشـکردنی هۆزەکـانو موڵکـەکانیانو رێگـری دەخسـتە بـەردەم بازرگانیـەکانیان. هـەروەها کـوردان لەسیاسـەتی فەرەنسـا لـەکۆنگرەی ئاشـتی نائومێدبون، ئەوەی کەتایبەت بو بەدابینکردنی هەرێمە

کوردیەکان بۆفەرەنسا. ئەو سیاسەتەش لەگەڵ یەکێتی کوردو لەگەڵ چالاکی بازرگانی لەکوردستاندا دژ دەوەستایەوە. بۆیە فاکتەرە نەتەوەیی‌و ئاینی‌و ئابوریەکان لەراپەڕینی گەلی کورد دژی دەسەڵاتدارانی فەرەنسا کارئاسانیانکرد.

# ڕاپەڕینی ئیبراهیم هەنانو

ئیبراهیم هەنانو لەخێزانێکی کورد بـو، لـەچیای زاویـە، کەکەوتۆتە باشـوری ڕۆژئاوای شـاری حەلەبەوەو لەوێ نیشتەجێ بـوە. ئیبـراهیم هـەنانو بەرێکـەوتن لەگـەڵ سـەرۆك هـۆزە کوردیـەکانی تـردا، بەتایبـەت لەگـەڵ مسـتەفا ئاغـا لەفەریریـە(6) تـوانی چـوار گروپـی سـەربازی پێکبهێنێـت، کەزۆربـەیان لـەجوتیارانی کـورد بـون‌و تـوانی بەفـەرمی شـۆڕش دژی فەرەنسـیەکان لـــەرۆژی(1920/9/16) ڕابگەیـــەنێت.(7) هـــەنانو ڕونکردنەوەیەکی بۆگەل دەرکردو تیایدا وتی:"فەرەنسا سـوپاکانی زاڵکـردوەو بـەڵێنی شـکاندوە، گفتـەکانی بەجێ نەهێناوە، ڕوی مێژوەکەی ڕەشـکردوە، بـەوەی بانگەشـــەی ئـــەوە دەکـــات، کەگوایـــە بۆیارمـــەتی‌و ئامۆژگـــاریکردن‌و پاراســـتنی ژیـــان‌و ســـەربەخۆییمان هاتوە. بانگەشـەکانی هیچ نین جگە لـەدرۆو تۆمـەت.. لەریزی هاوپەیمانانـدا دژایەتیمان دەکـات‌و شـۆڕشـمان دژی حوکمی تورکیا بەرپاکرد ئیتـر ئەنجامەکـەی چـی دەبێـت ببێـت. هاوپـەیمانان ناپاکیـان لەگـەڵ کـردین‌و نکـوڵی لەکێشـەکەمان دەکـەن‌و گاڵتـە بـەخوێنمان‌و خوێنی شـەهیدانمان بەبێ هیچ تاوانێك دەکەن، تەنیا ئەوەنەبێت کـەداوای پاراسـتنی ئـازادی‌و کەرامـەتمان دەکەین".(9)

بۆیـە جـەنگێکی خوێنـاوی لـەنێوان هـەردولا ڕویـدا، بـەهۆی وەڵامدانـەوەی کشـانی هێزەکـانی فەرەنسـا

بەســەر ناوچەکــە، قوربانیەکــەی ژمارەیــەکی گــەورە
لەجوتیارانی راپەڕیو بو لەژێر ســەرکردایەتی هــەنانودا.
لەبەرامبەریشــــدا هێـــزی بـــەرەنگاری تـــوانی زیـــاتر
لەشـــوێنێك زیـان بـەهێزەکانی فەرەنســا بگەیــەنێت،
بەتایبــەت زیانــەکان لەکەرەســتەی جــەنگیو گیانیــدا
گـــەورەو ئاپروبەرانـــە بـــون. هـــەروەك فـــەرمانڕەوای
فەرەنســا(جــەنراڵ غــۆرۆ)ی ناچــاربو جــوڵانی هێــزە
ســـــەربازیەکانی تونـــد بکـــات، بـــــەوەش تـــوانی
راپەڕینەکەی هــەنانو دابمرکێنێتــەوە. ئیبــراهیم هــەنانو
ناچار بو بۆقودس هەڵبێتو داوای یارمەتی لەپادشــای
ئــوردن(عەبــدوڵای کــوڕی حســێن) بکــات، بــەڵام
ئەفسوس کۆششەکانی هــەنانو بێســود بــون. لــەوێ
هێزەکـــانی بـــەریتانیا توانیـــان بیگـــرنو تەســـلیمی
فــەرمانڕەوای فەرەنســا، کــە لەســوریا بــو بکەنــەوەو
دادگاییکردنەکەشـــــی لەبـــــەردەم ئەنجومـــــەنێکی
سەربازی فەرەنسیدا تەواوبو.
هــەنانو لەبــەردەم ئــەو ئەنجومەنــەدا بــەرگریکــردو
وتی:"داوام لەجەنراڵ غۆرۆ کـرد راپرسـیەکی ئازادانـە
بەگەل بکات(مەبەستی گەلی کوردە لەسـوریا. و.ك)
بۆئەوەی خۆی بڕیـاری چارەنوسـی خـۆی بـدات، ئیتـر
بـۆچی ئـەوە ناکـەن؟ ئێـوە بـاش دەزانـن گـەل ئێـوەی
نـاوێو داوای پاراســتنی ســەربەخۆیی دەکـاتو ئێـوە
لەم وڵاتەدا نامۆن، دەسـتدرێژیکەرنو دەسـتدرێژکەری
داگیرکــەیش مــافی ئــەوەی نیــە دادگــایی بێتاوانــان
بکـــات".(10) بۆیـــە لـــەژێر فشـــاری جەماوەریـــدا

ئەنجومـەنی سـەربازی ناچـاربو هـەنانو ئـازاد بکـاتو ڕێگەی بەردەمی چۆڵ بکەن.
لەسـاڵی (1925) هـەنانو سـەرلەنوێ دانیشـتوانی لەسـەر ڕاپـەڕین دژی فەرەنسـیەکان لەناوچـەی شـاخی زاویـە هانـداو پەیوەندیـەکی پتـەوی لەگـەڵا سەرکردەی ڕاپەڕینی عەلەویو دروزیەکان دامەزرانـد، بـەوەش هـەنانو تـوانی لەگـەڵ هەریەکـە لەسەرکردەکانی وەك(شێخ ساڵح ئەلعەلیو سوڵتان ئـەترەش) فەرمانڕەوایـەتی سـەربازیی فەرەنسـا لەسوریا تێکبدەنو فەرەنسـا ناچـار بکـەن سیاسـەتی خـۆی لەبەریەککـەوتنو حـوکمی سـەربازی راسـتەوخۆوە بۆفێـڵو تەڵەکـەو سـازش بگۆڕێـت.
ئیبـراهیم هـەنانو لەسـاڵی(1935) نـەخۆش کـەوتو لەساڵی(1936)دا کۆچی دوایی کـرد، هـەنانو دوایـین ڕۆژەکـانی بەدڵسـۆزی بۆنیشـتمانەکەی بەسـەربردو هـەرچی پێکـرا لـەتوانا پێشکەشـی کـردو قوربانیـداو وایـدادەنا خـەباتی چەکـداری جـەماوەری شـێوازی ڕاسـتو کارایـە بۆرزگـاربون. ئـەوەی کەبەتونـدی توڕەبونی هەنانوی وروژاند، بریتی بو لەهاریکاریکردنی هەندێ لە سیاسیەکان (بۆرژوا بازرگانـەکانو هەنـدێ لـەخاوەن پـارەو موڵکـەکان) لەگـەڵ فەرەنسـیەکان و پـەنابردنی ئـەوان بۆشـێوازی سازشـکردن لەگـەڵ داگیرکـەر لەسـەر حسـابی بەرژەوەنـدی نیشتمانی.(11)

# داگیرکردنی ناوچەی جەزیرە

بەشـــێوەیەکی گشـــتی، کاتێـــك فەرەنســـا مـــەلیك فەیسـەڵی کوڕی حسێنی لەسوریا دەرکرد، لای هۆزە عەرەبیـــەکان رقێکـــی دوژمنکارانـــە دژی فەرەنســـا لەدایکبو، بەجۆرێك ئەو هۆزانـە نەیانـدەتوانی گەمـەی نێودەوڵـــەتی تێبگـــەن، هێنـــدەی ئـــەوەی کـــەرەوتی رۆژانـەی روداوە ناوچەییـەکان تێدەگەیشـتن. هـەروەك نەیانـــدەتوانی رێکـــەوتنی(ئینگلیـــز- فەرەنســـا) لەسـەرئەوەی ئاڵوگۆڕ لەناوچـەی نفـوزو دەسـەڵاتیاندا دەکەن ئیستیعاب بکەن. بۆیە زۆربـەی گـەورە پیـاوانی ئـــەو هـــۆزە عەرەبیانـــە دۆســـتایەتی خۆیـــان بۆهاشـمیەکانو ئینگلیـز دەربـڕی. ئـەوەی لۆژیکیانـە پێویستبو ئەوەبو، کەدەبو ئەو گەورە پیاوانـەی عـەرەب دژی فراوانخـــوازی ســـوپاکانی فەرەنســـا لەناوچـــە کوردیەکان(بـاکور) بـن، بـەڵام روداوەکـان ئـەو گریمانـە پێشـــبینیکراوەیان نەســـەلماند. لەناوچـــە کوردیـــەکان هـۆزی عـەرەبی سـەقامگیر بـەدی نـەدەکرا، تـەنها مەگەر گەیشتنی هەندێ هۆزی عەرەبی نـەبێ، کـە لەگـــەڵ رۆیشـــتنی مـــەڕو ماڵاتەکانیانـــدا (پیشـــەی ئاژەڵـداری) بۆهەنـدێ ناوچـەی باشـور لەناوچـەی جـــەزیرە، هـــەروەها تمـــوحی ئـــەوەیان هـــەبو، کەدەسـتبگرن بەسـەر ئـەو دەشـتانەداو روەو بـاکوری بەپیت بڵاوبنەوە، بەڵام روبەڕوی رێگـری هـۆزە کـوردە سەقامگیرو نیشتەجێکانی ئەو ناوچانە دەبونەوە، بۆیە

لەهاتنــە نــاوەوەی هێزەکــانی فەرەنســا بۆناوچــەی جەزیرە دەرفەتی گونجاویان بۆهێنانەدی ئومێـدەکانیان بینیەوە. بۆیە سـەرەڕای ئەوەی زۆرینەیان دۆسـتایەتیان بۆهاشمیەکانو ئینگلیز هەبو، بەڵام بەشـێکی گـەورە لەگــەورە پیــاوانی هــۆزە عەرەبیــەکان هەڵوێســتی پشــتگیریو یارمەتیدەرانــەیان بەرامبــەر هێزەکــانی فەرەنســا گرتەبــەر، لەکاتێکــدا هەنــدێ لــەهۆزەکان هەڵوێستێکی دوالیزمیان گرتەبەر. بەشێوەیەك یـەکێك یــان هەنــدێ ســەرکردەی هۆزێــك هەڵوێســتی پشــتگیری لەگــەڵ فەرەنســیەکان دەگرتەبــەرو هەنــدێکی تریــان لەهــەمان هــۆز هەڵوێســتی هاوپەیمانیان لەگەڵ کوردان دەگرتەبەر، بـەڵام کـوردان دژی ئینگلیز بون، ئەوانـەی کـە لـەدۆخی شـەڕدا بـون لەگــەڵ شــێخ مــەحمودی بــەرزنجی(لەباشــوری کوردســتان-و.ك). هــەروەها دژی فەرەنســیەکانیش بون، کە لەگەڵ تورکاندا رێکەوتبون.

بۆیــە لــەپێناوی لــەنێوبردنی راپەڕینەکــەی شــێخ ســەعیدی پیــران، کــە لەســاڵی(1925) لەناوچــەی دیاربــەکر هەڵگیرســا. دەســەڵاتدارانی تورکیــا لەســەرەتای مــانگی ئــازار داوایــان لەحکومــەتی فەرەنســا کــرد، رۆژانــە رێگــە بەتێپــەڕینی چــوار شەمەندەفەر لەسـەر هێڵی ئاسنینی بەغـداد بـدەن، بۆگواســتنەوەی(20) هــەزار تــاوەکو(25) هــەزار پیــاو لەگەڵ کەلوپەلە سـەربازیەکانیان بۆگۆڕەپـانی کـردەوە سەربازیەکان.(12)

لەکۆتایی مانگی ئایاری(1925ز)دا، حکومـەتی تورکیـا جـارێکی تـر داوای لەحکومـەتی فەرەنسـا کـرد رێگـە بەتێپـەڕینی کۆمـەکیو پاڵپشـتی لەرێگـەی سـوریاوە لەسـەر هێڵـی ئاسـنینی بەغـداد بـدات .(13) ئـەم هەڵوێسـتە دوژمنکارانـەی فەرەنسـیەکان بەرامبـەر کـورد یارمـەتی بوژانـەوەی گیـانی نەتـەوەیـیو بەهێزکردنی ئیرادەی بـەرگری لای کـوردانی ناوچـەی جـەزیرە لـەکاتی داگیرکردنـی لەلایـەن هێزەکـانی فەرەنساوە دا. دوای تێکشکانی هێزەکـانی دەوڵـەتی عوسمانی لەبەردەم هاوپەیماناندا، ناوچەی جەزیرەی کـوردی لـەژێر ملکـەچی دەسـەڵاتی سـەرکردەی هۆزەکانیدا مایـەوە، سـەرەڕای هەوڵـەکانی فەرەنسـا بۆبڵاوکردنەوەی نفوزو دەسـەڵاتی خـۆی بەسـەر ئـەو ناوچەیەوە لـەماوەی سـاڵی(1922)، بـەڵام نـەیتوانی ئومێدەکانی وەدیبهێنێت.

هێزەکـانی فەرەنسـا لـەمانگی حـوزەیرانی سـاڵی(1925) بەسـەرکردایەتی(رۆکـان) چونـە نـاو ناوچەی جەزیرەوەو(مەشعەل پاشا الجربا)، کەیـەکێك بـو لەگـەورە پیـاوانی هـۆزی شـەمەری عـەرەبی پێشـوازی لێکـردنو ئەنـدامانی هۆزەکـەی خسـتە خزمەتی هێزەکـانی فەرەنسـاوەو هـەرچی پێویسـتبو کۆمەکی کردن. رۆکانو لایـەنگرانی رویـانکردە شـاری نوسـەیبین، کە لەلایەن تورکانەوە داگیرکرابـو، لەبـەری باشـوری شـارەکەوە قـەڵای سـەربازی دروسـتکرا، دواتـریش شـاری قامیشـلی ئێسـتا بەدەوروبەریـدا

بونیاتنرا. بەڵام هۆزی(تەی) عەرەبی لەوکاتەدا بۆدو کۆمەڵ دابەشبون، کۆمەڵی یەکەم بەسەرکردایەتی گەورە پیاوی هۆزەکە(نایف عەبدوڕەحمان) لایەنی فەرەنسیەکانی گرتو بەهەمو توانایەك هاوکاری کردن، لەکاتێکدا کۆمەڵی دوەم بەسەرکردایەتی برای گەورە پیاوی هۆزەکە(محەمەد عەبدورەحمان) لەگەڵ هۆزە کوردیەکاندا لەبەرهەڵستیکردنی داگیرکاریی فەرەنسا هاریکاری کرد.(14)

فەرەنسیەکان لەگوندی(بیاندور) کەدەوروبەری(17کم) لەشاری قامیشلیەوە دورە، نیشتەجێ بونو ناوەندێکی کارگێڕییان بەپلەی قایمقام بۆبەڕێوەبردنی ناوچەکەو جێبەجێکردنی فەرمانەکانی فەرەنسا بەسەر دانیشتوانو وەرگرتنی باج دامەزراند.(جاسم ئەفەندی)یش بۆبەڕێوەبردنی ئەم ناوەندە دیاریکرا.

ئەم دۆخە توڕەیی سەرکردەی هۆزە ناوچەییەکانی وروژاندو رقلێبونەوەی جوتیارانیشی دژی هێزەکانی فەرەنساو بەکرێگیراوەکانیان بەهێزکرد. بۆیە بەرگری دژی فەرەنسیەکان توندتر بو، هۆزەکان گروپی چەکداریان بۆتۆقاندنی(کارگێڕی فەرەنسی)و تێکدانی پێکهاتەکانیانو ترساندنی بەکرێگیراوانیان پێکهێنا. ئەو گروپانە بەشەودا هێرشیان دەکردە سەر ناوەندی قایمقامیەت لەگوندی بیاندورو هەرچیان پێبکرایە لەکوشتنو تاڵانو یرۆیی دەیانکرد. لەیەکێك لەهێرشەکانیاندا توانیان جاسم ئەفەندی بە توندی بریندار بکەن. دەسەڵاتدارانی فەرەنسا هەڵمەتێکی

زۆر توندوتیژانـــــەیان دژی کــــوردانو کەســــــایەتیە ناوچەییــەکانیان دەســتپێکرد، بۆیــە خــەلیل ئــەحمی کەموختاری گونـدی بیانـدور بـو، لەگـەڵ(عـەباس ئاغـا محەمـــەد عـــەباس) موختـــاری گونـــدی محرکـــان هــەردوکیان دەســتگیرکران.(15) هــەردوکیان لــەکاتی سـزادان لەسـەر دەسـتی دەسـەڵاتدارانی فەرەنسـا گیانیان لەدەسـتدا، لەکاتێکـدا هەنـدێ لەسـەرکردەی هۆزەکـان پـەنایان بردەبـەر ناوچـە کوردیـەکانی تـر. جوتیارەکـــــان ئازایانـــــە روبـــــەڕوی هەڵمەتـــــە سەرکوتکاریەکانی فەرەنسا بونەوەو زۆرێکیان لـەکاتی پێکدادانـــە چەکداریەکانـــدا شـــەهیدبون. بۆیـــە دەسـتگیرکردنی هاوڵاتیـانی کـورد بـو بـەڕێو شـوێن گرتنەبـەری رۆژانـە کەبەنزیکـەیی هـەمو گوندنشـینە کوردیــەکانی دەگرتــەوە. لــەکاتێکـدا خێڵــە عەرەبــە هاوپەیمانـــەکانی کـــورد، رێژەیـــەکی کـــەمتریان لەســـەرکوتکاریو داپڵۆســـینی هێزەکـانی فەرەنســا بەرکــەوت، ئــەوەش یەکــەم: لەبەرئــەوەی لــەڕوی نیشـــتەجێبونەوە نـــاجێگیربونو توانایـــەکی گـــەورەیان هـــەبو لەجوڵـــەو گواســـتنەوەدا. دوەم لەبەرئـــەوەی زۆربـــەی ئەنـــدامانی هێزەکـــانی فەرەنســـا لـــەهۆزە عەرەبیـــە هاوپەیمانـــەکانیان بـــونو ســـەرکردەکانی داگیرکـەر راکێشـانی ئـەو عەرەبانـەی، کـە لـەدژیان راپـــەڕیبون لەرێگـــەی سازشـــکردنەوە لـــەبری ملکەچکردنیان بەهێزو داپڵۆسین، بە باشتر دەزانی.

گیــانی بەرهەڵســـتکاری لای جوتیــاران لەئــەنجامی دەســـتگیرکردنە چڕوپڕەکــان تونـــدتر بـــو، هـــەروەها ژمارەیەکی گەورە بریندار کەوتەوەو فەرەنسـیەکانیش سـوربون لەسـەر کۆکردنـەوەی بـاج لەسـەر بەروبومـە کشــــتوکاڵیەکانو ئاژەڵـــداری، بۆیـــە جوتیـــاران لەهەڵوێســــتی نێگـــەتیڤی بەرهەڵســـــتکاریەوە گواســـتیانەوە بۆهەڵوێســـتی دەستپێشـــخەریکردن لەبەرهەڵستکاری سوپای فەرەنسیدا.

لەســـاڵی(1926) هێـــزی بـــەرەنگاری گونـــدی(تـــل شعیر)ی کردە مەڵبەندی خۆیو پلانی بۆ هێرشـکردنە سـەر قەڵای سـەربازی بیاندور دانا، لەپێناوی ئەوەشـدا کـوردان توانیـان باشـترین هاریکـاری لـەنێوان خۆیانـدا بەدەستبهێنن لەلایەكو تێگەیشتنیش لەگەڵ هەنـدێ خێڵــی هــۆزی(تــەی)ی عــەرەبی(کۆمــەڵی شــێخ محەمەد عەبدورەحمان) خێڵی جەواله لەلایەکیترەوە. توانرا گروپێکی چەکدار کە پێکهاتبو لەجوتیارانی کوردو بریتیبـون لـە (عـەباس مـوراد، عەبـدۆ تیمـار، عـەلی عەبدولمەجید تیمار، حەسۆ عەبـدوڵڵاو گـەنجانی تـر) لـــە بەشـــی باشـــورەوە ئامـــادە بکرێـــت. لـــەلای ڕۆژهەڵاتــەوە حــاجی حەســۆ تــەیار ســەرکردایەتی هێرشـکردنی دەکرد، یەکەم هێرشـی جوتیاریی تاوەکو ئێــوارەی ڕۆژی دوایــی بــەردەوام بــو(16)، ژمارەیــەك لەجوتیاران لـەو هێرشـەدا شـەهیدبون، بـەڵام هێـزی بەرەنگاری توانی قـەڵای فەرەنسـیەکان داگیـر بکـاتو زیانی گیانیو مادی زۆر لەسوپای فەرەنساش بـدات،

لەکاتێکـدا ئـەوەی مـابۆوە لەسـەربازانی فەرەنسـا پـەنایان بـردە بـەر هـەڵهاتن و لەگـەڵ سـەرکردەکەیاندا(ڕۆکـان) پـەنایان بۆمەشـعەل پاشـا الجرباو هەندێ خێڵـی(تـەی) ی شـوێنکەوتەی شـێخ نایف عەبدورەحمان برد.
ڕۆکـان و سـەربازانی پـێش جـەنگی بیانـدور ئـارەزوی داگیرکردنی(فیشخابور)یان هەبو، کە لەسـەر سـنوری عێـراق-سـوریایە، بەمەبـەسـتی پێکهێنـانی دامەزراوەیـەکی کـارگێڕی-سـەربازی تیایـدا، لـەپێناوی ئەوەشـدا ڕۆکـان پێویسـتی بەهەنـدێ کەسـی کـورد هەبو بۆئەوەی وەك ڕێنشیاندەر لەکارەکەیدا هاریکاری بکـەن. دوای ئـەوەی نـەیتوانی لەڕێگـەی تۆقاندنـەوە پشتگیری وەدەست بخات، پـەنای بـردە بـەر شـێوازی ئیغراکـردن بـەپارەو بـەڵێن، بـەوەش تـوانی هەنـدێ جوتیـاری هـەژار لەنمونـەی(عـەلی مسـتو ئوسـی و حەسـەن هـزو) لەگونـدی(حلـوە)و سـەید تـاهیر لەگوندی بیاندور ئیسـتغلال بکـات. ئـەو بەکرێگیراوانـە لەکشـان بـەرەو فیشـخابور هاوڕێیـەتی فەرەنسیەکانیان کرد، بۆیە هێزەکانی بەرەنگاری کـورد بەسـەرکردایەتی ئـال حەسـۆ بـەرەکات وەڵامیـان دانـەوەو جـەنگێکی خوێنـاوی لـەنێوان هـەردولا لـە(دمرقـابی) رویـداو یـەکێك لەگـەورە پیـاوانی هـۆزی(شـمر الخرصـة) بـەناوی(مثقـال العاصـی) پەیوەندی بەهێزی بەرگری کوردەوە کـرد، بـەڵام دواتـر بـەهۆی دەسـتێوەردانی هەنـدێ لەکەسـایەتیەکانی

فەرەنسا لەكوشتار دژی رۆكانو سەربازانی راوەستا، بەتایبەت پاشئەوەی ئەم گەورە پیاوە عەرەبیە بەڵێنی راستگۆیی لایەنگرەكانی لەرۆكانەوە بەدەستهێنا. بەڵام هۆزی جەوالەی عەرەبی لەتەنیشتی هۆزە كوردیەكانەوە بەردەوامبون لەبەرگریكردنی هێزەكانی فەرەنسا. جەنگەكە بۆگوندی قەترانیە گوازرایەوە، پاشان لە(كرە توبی) یەكلایی بویەوەو ژمارەیەكی گەورە لەجوتیاران شەهیدبون، بەڵام لەكۆتاییدا هێزی بەرگری توانی شكستێكی خراپ بەفەرەنسیەكانو لایەنگرەكانیان بگەیەنێت، ئەوەش پاش كوژرانی(رۆكان)ی سەركردەی هەڵمەتە سەربازیەكە بۆسەر ناوچەی جەزیرە، ئەوەش لەپایزی ساڵی(1926) دا بو، بەمەش ناوچەكە بەبێ دەسەڵاتی كارگێری تاوەكو كۆتاییەكانی ساڵی(1928) مایەوە.(17)

لەماوەی ساڵی(1925) دەرفەتێك بۆگەلی كورد لەتوركیا لە پێناو دامەزراندنی دەوڵەتێكی كوردی سەربەخۆ رەخساو شۆرش بە سەركردایەتی شێخ سەعیدی پیران لەناوچەی دیاربەكر دەستیپێكرد، بەڵام بەهۆی هاریكاری توركیا- فەرەنساو بەهۆی نەبونی یارمەتی دەرەكی بۆكوردو نەبونی رێكەوتنی كورد لەنێو خۆیدا، توركیا توانی ئەو شۆرشە سەركوت بكاتو جەنگێكی كرداری دژی گەلی كورد هەڵبگیرسێنێت. داپڵۆسینو سەركوتكردنی دەسەڵاتدارانی توركیا زنجیرەیەك راپەرینی ناوچەی

وەك راپـــەڕینی حـــاجۆ لـــەمانگی ئـــازاری(1926) لەناوچەی نوسـەیبین لێکەوتەوە، هەرچەندە نـەیتوانی هیچ سـەرکەوتنێکی سـەربازی- ستراتیژی دژی تورکیـا بەدەســت بهێنێــت، بــەڵام ئــەو راپەڕینــە دیاردەیــەك لەدیاردەکانی یـەکێتی نەتـەوەو خـاكو گـەلی کـوردی دوبارەبوەوەی بەرجەستە کرد.(18)

ناوچەی جەزیرە تاوەکو کۆتـایی سـاڵی(1927) بـەبێ هـیچ دەسـەڵاتێکی کـارگێڕی مایـەوەو فەرەنسـیەکان نەیانتوانی بەسـەریدا زاڵبـبن، تـەنها دوای رەزامەنـدی هەنــدێ ســەرۆك هــۆزی بــەهێزی کــورد نــەبێت، لەنمونەی حاجۆ ئاغای هـەڤیرکیو عەفـدی فلـو ئاغـا میرســینی.(19) لەکاتێکـدا هەنـدێ سـەرۆك هـۆزی کــوردی تــر دژی فەرەنســیەکان مانــەوە. ئەمــەش هۆکارێك بـو لـەرودانی نـاکۆکی لەناوچـە کوردیەکانـدا لەنێوان دژایەتیکردنی فەرەنسیەکانو پشـتگیریکردنیان لەلایەکی ترەوە.

# چوارەم- راپەڕینەکانی ساڵانی سیەکان

(2)

گۆڕەپانی سوریا لەساڵانی سیەکان شەپۆلێکی ناڕەزایی میللی گەورەی دژی دەسەڵاتدارانی فەرەنسا بەخۆوە بینی‌و ململانێکان لەوماوەیەدا لەنێوان فەرەنسیەکان لەنێوان سەرکردە خێڵەکی‌و دەرەبەگی‌و ئاینیەکاندا بو، کەپشتیان بەجەماوەری جوتیاران دەبەست. لەمیانەی ئەو ماوەیەدا بۆرژوای شارەکان (گروپی رۆشنبیران‌و بازرگانان) وەکو هێزێکی کۆمەڵایەتی هەڵکشاوو خاوەن بەرژەوەندی ئابوری هاوسەنگ لەڕوی قۆناغبەندیەوە، لەگەڵ جۆری بەرهەمهێنانی کۆلۆنیالیزمی دەرکەوتن، بەجۆرێك ئەو چینە بۆرژوایە خۆی وەك میانگیری ئابوری‌و بەکرێگیراوی سیاسی لەنێوان مەڵبەندی سەرمایەداری کۆلۆنیالیزمی(میترۆپۆلی فەرەنسا)و بازاڕی لۆکاڵیدا لەسوریا پاڵاوت.

ئەوەی کەگروپی رۆشنبیرو ئەفەندیەکان بەتوندی تموحیان بۆی هەبو بریتی بو لەبەدەستهێنانی پۆستە کارگێڕی‌و پێگە سیاسیەکان‌و رێکخستنی موچە. بۆئەوەی بۆرژوای شارەکان بتوانن کارە بەرژەوەندیخوازانەکەیان بەمەرجێکی باشتر جێبەجێ

بکەن‌و دەسکەوتی زیاتر وەدەست بخـەن، لەسـەریان پێویست بو لەگەڵ سەرکردەی گوندەکاندا(ئاغا، بەگ، شـێخ، مـەلا....) کەبەسـەر بەرهـەمی کشـتوکاڵیدا باڵادەسـت بـون ببنـە هاوپـەیمان. دەسـەڵاتدارانی فەرەنسا وایانبینی ئـەم هاوپەیمانێتیـەی نێـوان شـارو لادێ، لــەبارودۆخی سـاڵانی بیســتەکان، زیـان بەبەرژەوەندی بەرهەمهێنانی سەرمایەداری ناوەنـدی دەگەیـەنێ‌و قۆسـتنەوەی بـەردەوامی کۆلۆنیـالیزمی تێکدەدات‌و سەردەکێشـێ بۆزۆربونی تێچونی کـارگێڕی کۆلۆنیالیزمی، بۆئـەوەش لـەماوەی سـاڵی(1927)ەوە دەسـەڵاتدارانی فەرەنسـا پـەنایان بۆهـەوڵی جیاکردنەوەی بۆرژوای شارەکان لەهێزی لادێی پشت بەسـتو بەجـەماوەری جوتیـاران بـرد، یـان لانیکـەم بێلایەنکردنیان. بۆیە فەرەنسیەکان دەستیانکردە وتـوێژ لەگەڵ بۆرژواکان، بەتایبەت لەگـەڵ عـەرەبی سـوننەو لەسـەر هەندێك مەرج بۆبـەڕێوەبردنی وڵات‌و(کـارگێڕی بـازاڕی ئـابوری) سازشـیان لەگەڵـدا کـردن. بـەوەش شێوەی ململانێکـە لەخـەباتی چەکـداری جوتیارانـەوە لـەلادێ گوێزرایـەوە بۆسازشـی ئـابوری‌و سیاسـی لەشارەکاندا. تاوەکو ئەوکاتە، بۆرژوای کوردی رۆڵێکـی وای نـەگێڕا، تـەنها رۆڵێکـی پەراوێزیانـە لـەپانورامای روداوەکاندا نەبێت. بەنیسبەت کۆمەڵگەی کوردیشـەوە تـاوەکو ئەوکاتـە، گروپێکـی بـۆرژوای وا دەرنەکـەوتبو، کەبتوانێت سـازش لەگـەڵ دەسـەڵاتدارانی فەرەنسـا بکات، بـەجۆرێك ئـەوەی دوایـی لەحسـابی تموحـاتی

جـەماوەری نەتەوایـەتی کوردیـدا نـەبـو، بەشـێوەیەك فەرەنسـا دودڵ نـەبو لەرێگـەدان بەگواسـتنەوەی سـوپاکانی تورکیـا لەسـەر هێڵـی ئاسـنین لـەپێناوی دامرکاندنـەوەی راپـەڕینی شـێخ سـەعیدی پیـران سـاڵی(1925). هاوکـات دەسـەڵاتداران بارەگـای لیژنەی جێبەجێکردنی کۆمەڵـەی خۆیبونیـان لەشـاری حەلـەب لـەهاوینی سـاڵی(1928) هەڵوەشـاندەوە، سەرەڕای ئەوەی ئەو کۆمەڵەیـە داوای هـیچ مـافێکی سیاسـی بۆکوردانی سوریا نەدەکرد.

جگـە لـەوە دەسـەڵاتدارانی فەرەنسـا دەسـتوریان بۆهەمو ناوچەو گروپەکانی سـوریا بڵاوکـردەوەو بـونی نەتـەوەیی کوردیـان بـەئیعتبار لەسـەر ئاسـتی دەسـتوری وەرنـەگرت، تەنانـەت بەنیسـبەت ئێزیدیەکانیشـەوە کـە لـەکاتی جـەنگی یەکـەمی جیهانیـدا فەرەنسـیەکانیان سەرخسـتبو، بـەهۆی باسـنەکردنیان لەلایـەن فەرەنسـیەکانەوە توشـی نائومێدی بون، بەتایبەت ئەوەی پەیوەندی بەداواکاریـە ئاینیو ناوچەییەکانیانەوە هەبو.

# ڕاپەڕینەکانی ناوچەی (جبل الاکراد)

فەرەنسیەکان لەپێنج ساڵی یەکەمی داگیرکاریاندا هەوڵیاندا بەچەك نفوزی خۆیان لەناوچە کوردیەکان بڵاوبکەنەوە، بەڵام ئەم سیاسەتە روبەڕوی بەرەنگاریەکی میللی چەکدارانەی گشتی بویەوە، بۆیە لەهەردو ناوچەی(جبل الاکراد و جبل الزاویة) (20)، کوردان بەرەنگاری هێزی داگیرکەری فەرەنسایان کردو قوربانی گەورەیان پێشکەشکردو زیانی گەورەیان لەفەرەنسیەکان، دا. دواتر دەسەڵاتدارانی فەرەنسا ناچاربون شێوازی سازشکردن بۆراکێشانی کەسانی خاوەن دەسەڵاتو نفوزەکان لە ناوچەکە بگرنەبەر، بەکرداریش ئەو دەسەڵاتدارانە توانیان لایەنگری زۆرێك لەسەرکردە خێڵەکیە بەهێزە کوردیەکان چنگ بخەن. جگە لەئێزیدیەکان، فەرەنسیەکان پەیوەندی باشیان لەگەڵ سەرکردەکانی عەشیرەتی گەورەی(جومی)دا بەست، هەروەها لەگەڵ ئەحمەد ئاغا کیخ میللیو لەگەل نەوەکانی برازای شێخۆ فائیق ئاغا، کەخاوەنی نفوزێکی بەهێزبو لەناوچەی(جبل الاکراد)، ئەم دوانەی دواییان دۆستایەتی فەرەنسیەکانیان بەباشتر زانی، ئەگەرچی لەسەر حسابی بەرژەوەندی نەتەوایەتیش بو، بەشێوەیەك وەڵامی بانگەوازەکەی

شێخ سەعیدی پیران (سەرکردەی راپەڕینی دیاربەکر دژی تورکان) نەدایەوە. کە ئەوەش ئاسان‌و دەشکرا، واتە دەتوانرا رێگەی ئاسنین لەتورکیا ببڕێت‌و بتەقێنرێتەوە. چونکە هێڵە ئاسنینەکە تاکە ئامرازی خێرا بو بۆگەیشتنی کۆمەکی ئاڕاستەکراو بەسوپای تورکیا لە رۆژئاواوە بۆ رۆژهەڵات دژی شۆڕشی کوردان، بەڵام سەرکردەکانی ناوچەی(جبل الاکراد) لەبەجێهێنانی ئەم بانگەوازە نەتەوەییە دواکەوتن.(21) ئەمەش رۆڵی هەبو لەکەمکردنەوەی سەرمایەی نەتەوەیی لەریش سپی‌و سەرکردە خێڵایەتیەکان لەنێوان جەماوەری کوردیدا، کە بە پەرۆشەوە بون بۆیارمەتیدانی کوردانی راپەڕیو لەناوچەی دیاربەکر. لەلایەکیترەوە ئابوری(کشتوکاڵی) کورد لەو ناوچەیە دواکەوتو بو، هەروەها شوێنکەوتەی کۆنترۆڵی بۆرژوای بازرگانی کوردی بو، ئەمەش وایلێکردبو نەتوانێ دەسکەوتە نیشتمانیەکان وەدیبهێنێ. بۆیە گروپی رۆشنبیران بەرپرسیارێتی نیشتمانیان دژی هێزەکانی تورکیاو فەرەنساو هاوپەیمانەکانی لەسەرکردەی خێڵە کوردیەکان گرتەئەستۆ. ریفۆرمیستی کۆمەڵایەتی کورد (ئیبراهیم خەلیل)، کەپێشتر ئەفسەرێك بو لەسوپای عوسمانی، بەپشت بەستن بەهەندێ بنەمای ئیسلامی لەبواری دادپەروەریدا، هەستا بەسەرکردایەتیکردنی بزوتنەوەیەکی نیشتمانی لەناوچەکە.

لــــەنێوان کوردانـــدا بــــەبیروباوەڕێکی(کۆمەڵایــــەتی-ئـــاینی)یانــــە مــــژدەی داو تــــوانی وەك ئــــامرازێکی ئایدیۆلۆژی بۆبزوتنەوە نیشتمانیەکەی بەکاری بهێنـێ. بۆیـە بەرهەڵسـتی تورکـە کـەمالی‌و فەرەنسـیەکانی پێکـەوە بـەناوی ئیسـلامەوە کـرد، لەکاتێکـدا بـەناوی دادپەروەری کۆمەڵایەتیەوە جوتیـارانی دژی سـەرکردە خێڵایەتیەکان‌و خاوەن زەویـە گـەورەکان، ئەوانـەی کـە لەگــــەڵا دەســــەڵاتدارانی(تورکیــــاو فەرەنســــا)دا هاوکــاربون، هانــدا. بۆئــەوەش ئیبـــراهیم خـــەلیل بەخێراییەکی گونجاو پشتگیری چینە کۆمەڵایەتیـە زۆر هـــــەژارەکانی لـــــەنێو کـــــورددا بەدەســــــتهێنا. لەسـاڵی(1930)یـش دوای هاتنـە نـاوەوەی هەنـدێ لەرۆشـنبیران بۆنێـو بزوتنەوەکـەی، ئیبـراهیم خـەلیل رێکخراوێکی بۆرێکخستنی شوێنکەوتوانی دامەزرانـد، کە ناونرا (رابطة المريدين). دوای ئەوەی بزوتنەوەکەی ئیبراهیم خەلیل شـەقڵێکی رێکخراوەییانـەی وەرگـرت‌و بو بـەهاوڕێی چـالاکی بزوتنەوەکـە، لەگـەڵا راپـەڕینی بـــەناوبانگی(ئـــاگری) دا، دەســـەڵاتدارانی تورکیـــاو فەرەنسا هەڵمـەتێکی داپڵۆسـێنەرانەی تونـدیان دژی لایـــەنگرانی رابیتـــەی موریـــدینی چـــالاك لەناوچــــە کوردیەکان لـەچوارچێوەی سـنوری تورکیـا- سـوریا(ژێـر دەسـەڵاتی فەرەنسـا) هەڵگیرسـاند. هێـز سـەربازی‌و دامودەزگای پۆلیسی تورکیا هەستان بەئەنجامـدانی کوشـــــتارگەو قـــــەتڵ و عـــــامێکی دەســـــتەجەمعی وەحیشـگەرانە لـەدژی ئەنـدامانی رابیتـەی موریـدین‌و

خێزانـەکانیان لـەماوەی دەسـتپێکردنی بڵاوبونـەوەی ئەنـــدامانی رابیتـــەی موریـــدین، کـــە لەناوچـــە کوردنشینەکان لەترسی ستەمی ئەوان چوبونە ریزی ئـــەم رابیتەیـــەو بۆریزەکـــانی راپـــەڕینی ئـــاگری، کەئیحسـان نـوری پاشـا سـەرکردایەتی دەکـرد. لەکاتێکدا فەرەنسیەکان وایان بـەباش زانـی لەرێگـەی سـەرکردە خێڵایەتیـەکانی کـوردەوە، کەدۆسـتی فەرەنسا بون‌و لەڕوی سەربازیەوە کۆمەکیان دەکردن، دژایەتی‌و کوشتاری موریدیەکان بکات.

لەسەرەتاوە موریدیەکان هەستان بەپێکهێنانی گروپ‌و کۆمەڵـەی چەکـداری بچـوك بۆهێرشـکردنە سـەر هێزەکـانی تورکیـاو فەرەنسـاو بۆبەرهەڵسـتیکردنی سـەرکردە خێڵایەتیـە بـەکرێگیراوەکانیان. لـەدواتردا جـەماوەرێکی گـەورە لـەجوتیارانی کـورد، ئەوانـەی کـەئینتمایان بۆخێـڵ و خێزانـی رێکوپێـك هـەبو یـان لـــەزوڵم‌و زۆری ســــەرکردە خێڵایەتیــــەکانیان هەڵهاتبون(22) چونە ریزی بزوتنەوەکە. بزوتنەوەکەش دوای کۆتـایی هـاتنی پێـنج سـاڵ لەتەمـەنی، بـو بـەخاوەنی بنکەیـەکـی جـەماوەری وا، کـەتوانی بەرهەڵســتی فەرەنســیەکان‌و هاوپەیمانــەکانیان لەسـەرکردە خێڵایەتیـەکان بکـات. ئـەم پەرەسـەندنە گەورەیـە لـەهێزی بزوتنەوەکـە، وای لەفەرەنسـیەکان کـرد فشـار بخەنـە سـەر هێمـا ناوچەییـەکان‌و، پـێش بڵاوبونەوەی بۆناوچەکانی تـر، داوای کۆتـایی هێنـانی نفوزو دەسـەڵاتی موریدیەکان لەناوچەکەدا بکەن. بۆیە

سەرکردەی خێڵەکان هەستان بەچەوساندنەوەیەکی توند دژی هەر جوتیارێك، کەهاوکاری لەگەڵ موریدیەکان بکردایە. هەروەها داوایان لەپیاوانی ئاینی شوێنکەوتەیان کرد فەتوای سەرکۆنەکردنی موریدیەکان بدەنو ئەوانەش کەهاوکاریان دەکەن بەکوفرو بێباوەڕیو دەرچون لەفەرمانی لێپرسراوەکانیان سەرکۆنە بکەن.

لەژێر فشاری داپڵۆسینو چەوساندنەوەی چینایەتیو سیاسیدا، موریدیەکان پەنایان بۆشێوازی تیرۆرکردن دژی هێماکانی دەسەڵاتو بەکرێگیراوەکانیان لەریش سپیە ناوچەییەکان برد. ئەو تیرۆرکردنە سیاسیە سودی زۆری بۆموریدیەکان هەبو، بەجۆرێك پاش تیرۆرکردنی هەر سەرۆك هۆزێك، دەسەڵات لەهۆزەکەدا هەڵدەوەشایەوە، ئەمەش توانایەکی گەورەی بۆرزگاربونی جوتیاران لەدەسەڵاتی هۆزەکانو چونە ریزی بزوتنەوەکە بەخشی، پاشئەوەی موریدیەکان دڵسۆزیی خۆیان بۆجوتیاران بەشێوەیەکی بەڵگەنەویست سەلماند، ئەویش کاتێك بو سەرکردەی هۆزێکیان دەکوشت خراپ بوایە بۆجوتیارەکەیو لەگەڵ فەرەنساو تورکاندا مامەڵەی بکردایە. ئەم شێوازەش گەورەترین ئەنجامی بەخشی، ئەویش ئەوەبو لەتوانای ئاغاکان نەیاندەتوانی جوتیاران بکوژن، هەروەك رێوی کەدەستدرێژی دەکاتە سەر لاك.

سەرژمێریکردنی جوتیاران کۆتایی هات، بەڵام لەسەر دیمەنی پێنج گۆر بۆپێنج ئاغا رێك بەتەنیشتی یەکەوە لەرۆژئاوای شاری(بلبل)، هەروەك ئەگەر بهاتبا دەبوە پەیکەرێکی مێژویی بۆشۆرشێکی میللی جوتیاریی (23)، ناوچەکە جەنگێکی ناوخۆیی توندی بەخۆوەبینی، تیایدا پیاوانی دەست و پێوەندی دەرەبەگەکان هەستان بەکاری دوژمنکارانەی توندوتیژ دژی جەماوەری جوتیارانی دۆستی بزوتنەوەکەو ژمارەیەك لەسەرکردەکانی بزوتنەوەکەیان تیرۆرکردو ماڵەکانیان سوتاندن. بۆیە وەڵامدانەوەی بزوتنەوەکە خێرا بو، بەجۆرێك ئیبراهیم خەلیلی سەرکردە توانی جەماوەری جوتیاران بۆبەرپاکردنی راپەرینێك کەهەمو ناوچەی(جبل الاکراد) بگرێتەوە ئامادە بکات. فەرەنسیەکان هەستیان کرد جڵەوی کاروبارەکان خەریکە لە دەستی خۆیانو لەدەستی بەکرێگیراوەکانیان دەردەچێت.

هێزی سەربازی فەرەنسا لەساڵی(1936) بۆزاڵبون بەسەر بارودۆخەکە، سەرلەنوێ بەرەو(جبل الاکراد) پێشڕەویان کردو پێکدادانێکی توندوتیژ لەنێوان ئەو هێزانە لەلایەكو لەنێوان لایەنگرانی موریدیەکان لەلایەکی ترەوە رویدا، لەمیانەیدا سەرکردەکانی موریدین لێهاتویی‌و شایستەییەکی بێوێنەیان لەبەڕێوەبردنی کردە سەربازیەکانو بەرگریکردن لەزەویەکانیان نواند، بەشێوەیەك فەرەنسیەکانیان ناچارکرد کشانو جموجوڵ بوەستێنن. فەرمانڕەوای

فەرەنسـا لەناوچەکـە ئاگربەسـتی بـە مەبەسـتی وتـوێژکردن لەگـەڵ سـەرکردەی بەرهەڵسـتیەکەدا خستەڕو، ئەمەی دوایی شاندێکی پێکهێنا کەپێکهاتبو لـە(عـەلی فـەنوتو شـێخ عربکـو)، هـەردولا لـەدۆڵی(مەیـدانا) وتوێژیـان کـرد. لەوتوێژەکانـەوە دەرکـــەوت کەفەرەنســـیەکان هەوڵـــدەدەن بەرهەڵسـتیەکە بەشـێوازی فـرتو فێـڵ موراوەغـەو کڕینــی دڵنیــایی بکوژێننــەوە. مەبەستیشــان لەئاگربەسـتو وتـوێژ جگـە لـە چنگخسـتنی کـاتو هەوڵی درز تێخستنی ریزەکانی بەرگریو سەرلەنوێ سـەپاندنی کۆنترۆڵی خۆیـان  هیچـی تـر نـەبو، بـەڵام تیایــدا، واتــە لــەو وتوێژانــەدا شۆڕشـــگێڕان خۆبەدەســتەوەدانیان بۆمەرجــەکانی داگیرکــەران رەتکـردەوەو وتوێژەکـان شکسـتی هێنـاو شۆڕشـی کوردان لەناوچەی عفرین ماوەی پازدە ساڵ بـەردەوام بـو، لەمیانەیـدا ژمارەیـەکی گـەورە لەشۆڕشـگێڕان کوژران.(24)

هــەردو ســاڵی(1938-1939) خــاوەنی گــرنگین، بەتایبــەت بەنیســبەت ناوچەکــەو بزوتنــەوەی موریدیەکانــەوە، بەشـــێوەیەك ئەســـکەندەرونە بەشـێوەیـەکی کۆتـایی لـەرۆژی(24ی حـوزەیرانی 1939) بــەگوێرەی رێکەوتننامــەی نێــوان تورکیــا-فەرەنسـا، بـەتورکیاوە لکێنـرا، بـەڵام کـوردو عـەرەب بەهـەمو چـینو تـوێژە ئاینیەکانیانـەوە نکوڵیـان لـەم لکاندنـەی ئەسـکەندەرونە بـەتورکیاوە کـردو لـەم

بارودۆخـە ناوچەییـە گڕگرتـوەدا، تـوركو فەرەنسـیەكان پێكەوە رێكەوتنو هاوكاری یـەكتریان بۆدامركاندنـەوەی بزوتنەوەی موریدیەكان بەپێویسـتزانی، بەتایبـەت لـەو ناوچانـــەی كەوتوەتـــە دەســـتی توركانـــەوە، بـــەڵام لەباشـوری سـنورەوە(لەسـوریا)، بزوتنەوەكـە تـوانی لانیكـەم وەك بزوتنەوەیـەكی ئۆپۆزیسـیۆنی چەكـدار تـاوەكو سـاڵی(1947) لـەچالاكی سیاسـی خـۆی بـەردەوام بێـت، كاتێـك ئـەو بزوتنەوەیـە تـوانی سـزای مـــردن دژی ئەنـــدام پەرلـــەمان لـــە پەرلـــەمانی سـوریا،(شـێخۆ ئاغـا كـوردی) لەبـەردەم پەرلەمانـدا جێبـــەجێ بكـــات. وەك ســـزایەك بـــۆرابردوی وەك ســـەرخەرو هاوپـــەیمانی فەرەنسـیـەكانو چالاكیـــە دۆستانەكانی بۆحكومەتی سوریا، كەدەسـەڵاتدارانی فەرەنسـا نمونـەی وەك ئـەوی دەپاراسـتو نفـوزو دەســەڵاتو كـۆنترۆڵی بەســەر جوتیارانــەوە بــەهێز دەكـرد. لەراسـتیدا چـالاكی موریدیـەكان بوەهـۆی ئامادەكردنی گۆڕەپانی كورد بۆقبوڵكردنو بڵاوبونەوەی هـــزری دیموكراســـی-كۆمەڵایـــەتی. دواتـــریش بڵاوبونـەوەی بیروبۆچـونی شـیوعیەتی ئاسـان كـردو یارمـەتی لەسـەر پەرەپێـدانی هۆشـیاری نەتـەوەییو چینایەتی لەناوچەكە دا، بەشێوەیەك لەساڵی(1962) لـەنێوان موریدیـەكان لەلایـەكو رێكخـراوی حزبـی شـیوعی سـوریا لەناوچـەی(جبـل الاكـراد) لەلایـەكی تـــــرەوە بۆئەنجامـــــدانی هـــــەڵبژاردنی یاسادانان(التشریعی)، رێكەوتن كرا.

# ڕاپەڕین بۆسەرخستنی ئاگری (شۆڕشی ئاگری)

کۆمەڵـــەی خۆیبـــونی کـــوردی، کـــە لـــەلوبنان ســـاڵی(1927)(25) دوبـــارە پێکهـــاتو بـــەڕێوەبردنی ڕاپـــەڕینی کـــوردانی لـــەچیای ئـــارارات، کـــە لەسـاڵی(1926) دەسـتپێکردبو، گرتـە ئەسـتۆ. ئـەم کۆمەڵە سیاسیە دەستەبژێرێکی لەرۆشنبیران‌و ریش سپیانی کورد(لەتورکیاو سوریا) لـەخۆگرتبو، بـەجۆرێك جـەنراڵ ئیحسـان نـوری پاشـا وەك فەرمانـدەی سـەربازی‌و ئیبـراهیم حەسـەکی وەك فەرمانـدەی مـەدەنی بۆبـەڕێوەبردنی کردەکـان لـەچیاکانی ئـاگری دەستنیشانکرد.

سـەرەڕای ئەو سـەرکەوتنە مەزنانـەی، کەفەرمانـدەی شۆڕشـەکە بەدەستی هێنا، هێزەکانی تورکیـا توانیـان بەئاسـن‌و ئـاگر لـەناوی بـەرن. کـاتێکیش شۆڕشـەکە چـوە بـارودۆخێکی ناهـەموارەوە، دەسـتەی ناوەنـدی کۆمەڵـەی خۆیبـون لـەرۆژی(10ی حـوزەیرانی 1930) بۆسوك کردنی قورسایی هێرشەکانی تورکیا بۆسـەر شـۆڕشـگێڕان کۆبویـەوە، بۆیـە دەسـتەکە بڕیاریـدا لەباشوری رۆژهەڵاتەوە هێرش بکەنە سەر هێزەکـانی تورکیـا، واتـە لەسـەر سـنور لەگـەڵ سـوریا. هاوکـات شـەش بـەرە دیـاریکراو شـەوی(4/3 ی ئـابی 1930) بۆدەسـتپێکردنی هێـرش لەسـەر شـەش میحـوەر

لەسنوری عێراقەوە تاوەکو تەرابلوس دەستنیشانکرا. دەستپێشخەری سەربازیی کورد لەشەوی دیاریکراودا لەسەر میحوەرە دیاریکراوەکان دەستپێکرد، بەڵام درێژەی نەکێشاو بەردەوام نەبو، هەروەها دەستکەوتی گەورەشی بەدەست نەهێناو زانیاری پێویستیشمان لەبارەی هۆکارەکانی ئەوەوە لانیە. لەناوچەی کوبانە(ناوچەی دوەم) هەردو برا(بوزان بەگ شاهینو مستەفا بەگ شاهین)، کە راسپێردرابون هێرش بکەن، زۆر پیشڕەوییان نەکرد، پاشئەوەی هێزەکانیان توانیان مەڵبەندێکی پۆلیسی تورك لەسروج تێكو پێك بدەن. لەناوچەی چوارەمیش، ناوچەی سەری کانی(راس العین) مەحمود بەگ ئیبراهیم پاشای میللی وەك فەرماندەی ناوچەکە دەستنیشانکرا، بەڵام وەك ئەوەی لەسەری رێکەوتبون نەجوڵ. لەبەرەی دەرباسیەوە هێزێك بەفەرماندەیەتی ئەکرەم جەمیل پاشا، کە لە گەڵیدا قەدری بەگ جەمیل پاشا هەبو تاوەکو گەیشتە(6 کم) لەماردین دەرچو، بەڵام سەرکردەی هۆزەکان وەفایان بۆبەڵێنەکانیان نەبو، بۆیە هیچ دەستکەوتێکیان نەبو شایانی باسکردن بێت، بەڵام حاجۆ ئاغای سەرۆکی هۆزی هەڤیرکی کوردیو لەگەڵیدا جەلادەت بەدرخان، توانیان سنورەکان تێکبشکێنن‌و لەرۆژی(5ی ئابی 1930) گوندێکی بچوك لەناوچەی نوسەیبین داگیربکەن‌و رونکردنەوەیەکیان بڵاوکردەوەو تیایدا داوای سەربەخۆیی کوردیان کردبو وەك

پاڵپشتی کوردانی راپەڕینەکە لەپێناوی یارمەتیدانی نەوەی نەتەوە تێکۆشەرەکەیان لەسەر لوتکەکانی چیای ئارارات.(26) لایەنگرو چەکدارانی حاجۆ ئاغا توانیان هێزە سەربازیە جێگیرەکانی تورکیا لەناوچەی نوسەیبین تێك بشکێنن‌و یەکێك لەمەفرەزەکانی لایەنگری حاجۆ ئاغا بەفەرماندەیەتی(علیکی بەگی هەڤیرکی)و(شەمعونی حنی صیرۆ)، کەکوردێکی مەسیحی بو هێرشیان کردە سەر ناوچەی مدیات‌و جەنگێکی خوێناوی لەنێوان ئەمان‌و لەنێوان ئەو کەتیبە سەربازیەی، کە لەقەڵاکەدا جێگیربوبون رویداو ژمارەیەك لەلایەنگرانی حاجۆ ئاغا شەهید بون، بەڵام مەفرەزەکە توانی زیندانی قایمکراوی مدیات دەست بەسەرا بگرن، سەرەڕای نزیکی لەقەڵاکە، توانیان سەرجەم زیندانیەکان ئازاد بکەن، کەهەمویان کورد بون.(27)

سەرەڕای ئەوەی هەندێ هۆزو خێڵی کورد هاتنە ریزی حاجۆ ئاغاوە، بەڵام حاجۆ ئاغا نەیتوانی لەڕوی کۆمەکیە سەربازیە چڕوپڕەکانی هێزەکانی تورکیا، بەتایبەت پێکهاتە میکانیکیەکانی، خۆی رابگرێت، بۆیە ناچاربو بەرەو باشور(قامیشلی) پاشەکشە بکات، دوای ئەوەی لاپەڕەیەکی مێژویی نوێی یەکێتی کوردو یەکێتی بزوتنەوەی میللی کورد سەرەڕای سنورە سەپێنراوە کۆلۆنیالیزمیەکان بەسەریدا نوسیەوە.

# ڕاپەڕینی سەعید ئاغای دەقوری

(3)

لە ناوچەی جەزیرە جوتیارانی کورد لەلایەك بەدەست داکشانی توندی نرخی دەغڵو دانەوێڵەی کشتوکاڵی و تەماعی خاوەن زەویەکانیان و لەلایەکیترەوە بەهۆی پشتگیریکردنی دەسەڵاتدارانی فەرەنسا لێیان بەئەنقەست، کەجوتیارانیان دەچەوساندنەوە، دەیانناڵاند.
دەسەڵاتدارانی فەرەنساو تورکیا لەماوەی ناوەڕاستی سالانی سیەکان، ڕێو شوێنیان بۆچاودێریکردنی سنورەکان توندکردبوەو هاتوچۆیان پیایدا قەدەغەکردبو، ئەمەش ڕقو تورەیی هەمو کوردانی وروژاند، بەشێوەیەك سنورەکان هۆزە کوردیەکانی دابەشکردبو، بەوەش خێڵو خێزانە کوردیەکان هەڵوەشابونەوەو لێکترازابون. لەهەمانکاتدا دەسەڵاتدارانی فەرەنسا دەیانویست ریش سپیو پیاو ماقوڵانی کورد لەیەك نزیك بکەنەوەو یەکیان بخەن، بۆئەوەی بتوانن لەپێناوی بەرژەوەندی خۆیاندا بەکاریان بهێنن. کاتێکیش لەمەدا شکستیان هێنا، پەنایان بردەبەر توندکردنی ڕێو شوێنی داپڵۆسێنەرانە لەناوچەی ئەو هۆزە کوردیانەی ئامادە نەبون هاریکاری فەرەنسیەکان بکەن، ئەوەش بۆئەوەی ملکەچیان بکەنو بەسەریاندا زاڵبن.

هۆزی گاباری کوردی، که لەناوچەی عامودا جێگیـر بـو بون خاوەنی دەسـەڵاتو نفوزێکی ڕێژەیی خۆیان بـون، بۆیـە ئـەوەیان بەباشـزانی لەگـەڵ هـۆزی(دەقـوری)دا ببنە هاوپەیمان، کەئەوانیش لەشـارۆچکەی عـامۆداوە تــاوەکو ســنوری بــاکور نیشـــتەجێ بـــو بـــون. ئــەم هاوپەیمانێتیەش بەشێوەیەکی سەرەکی ئامانج لێـی بـــەهێزکردنی دەســـەڵاتی هۆزایـــەتی دەقـــوری‌و گاباریەکان بـو، ئـەو دەسـەڵاتەی کـە لـە ڕۆژهەڵاتـەوە لەلایەن هۆزی میرسینیەکان‌و لەڕۆژئاواشـەوە لەلایـەن هۆزی میللیەوە دەجولێنرا.

لەســـاڵی 1936 فەرەنســـیەکان باجیـــان لەســـەر جوتیـــارانی ناوچـــەی عـــامودا قورســـکرد. هاوکـــات ڕاوێژکـاری حکومـەتی فەرەنسـا لەناوچەکـە سـوربو لەسـەر ئەوەی ئەو نـاکۆکی‌و کێشـانەی لەناوچەکـەدا ڕوویاندەدا لەڕێگەی دادگاکانەوە چارەسـەر بکـات، نـەك لەڕێگـەی سـەرۆکی ناوچـەیی هـۆزە کوردیـەکان یـان بریکارەکانیانـــەوە، هـــەروەك پێشـــتر وەك نـــەریتی کۆمەڵایـــەتی بـــاو بـــوە. ســـەرۆکی هـــۆزی گاباری(شێخموس هەسـۆ) لەگـەڵ سـەرۆکی هـۆزی دەقـوری(سـەعید ئاغـا)، پێکـەوە ڕێکـەوتن لەسـەر ئەوەی لەفـەرمانی فەرەنسـیەکان یـاخیبن‌و لـەدژیان ڕاپـــەڕن. بۆئـــەو مەبەســـتەش دوای پێکهێنـــانی ئەنجومـەنی هۆزایـەتی سـەربازی بـەسـەرکردایەتی سـەعید ئاغـای دەقـوری، تـوانرا جـەماوەری ناوچـە کوردنشینەکان سازو ئامـادە بکرێـت‌و چەکـدار بکـرێن،

کاتێکیش هـاوینی 1937 هـاتو درویْنـەوەی بـەربومی دانەوێڵە دەستیپێکرد، دەسـەڵاتدارانی ناوچەی عامودا وەرگرتنـــــی باجیـــان لەلایـــەك چـــڕ كـــردەوەو لەلایەکیتریشـەوە پاسـەوانو حیجـزی ئەحتیاتیشـیان لەبەرژەوەنـدی خـاوەن زەویـەکان لەسـەر زۆربـەی جوتیـاران سـەپاند. بۆیـە سـەعید پاشـای دەقـوری کاردانـەوەی جوتیـارانی دژی ئـەو رێو شـوێنانەی لـەدژیان گیرابونەبـەر چنیـەوەو بەسـەرۆك خێڵـەکان، ئەوانـەی دژی فەرەنسـیەکان راپـەڕینیان قبوڵکردبـو راگەیانـد: پێویسـتە هـیچ باجێـك بـەباجوەرگرەکان نـەدەنو نوێنـەری دەسـەڵات لەناوچەکـە بەتـەواوەتی دەربکەن. دواتر یەکەی چەکداری لـەجوتیاران لەهـەمو گوندێك پێکهێنرا، کەئـەرکو وەزیفـەی پاسـەوانیکردنی گوندو بـەرگریکردن بـو لێـی. هـەروەك یەکـەی جـولاوو گـــەورەتر لەیەکـــەی گونـــدەکان بۆروبەڕوبونـــەوەو شـەڕکردنو پێکـداداان لەهـەمو ناوچـەکان پێکهێنـرا. کاتێکیش ئەنجومـەنی هۆزایـەتی، کەسـەعید ئاغـای دەقـوری سـەرکردایەتی دەکـرد داوای بکردایـەو فەرمانی پێبکردنایە بۆشـەڕ ئامادە دەبون.

مـاوەی نیـوەی یەکـەمی مـانگی حـوزەیرانی 1937 بەسـەرکردایەتی سـەعید ئاغا تـوانرا هـەمو نوێنـەرانی دەوڵەت لەناوچەی عامودا وەدەربنرێت، بۆیە راوێژکاری سـەربازی فەرەنسـا لەقامیشـلی کـەرتی سـەربازی راســپارد راپـەڕینەکــەو ســەرکردەی هۆزەکــانی ناوچەکـەش لـەناو ببـات. ئـەم راوێژکـارە هیوایشــی

خواست هۆزی میرسینی لەمەدا یارمەتیبدەن، بەڵام سەرۆکی هۆزەکە(عەبدی خلو) ئەگەرچی پێشتر کارئاسانی بۆفەرەنسیەکان لەناوچەکەدا کردبو، بەڵام بەهۆی پاڵنەری نەتەوەییەوە ئامادەنەبو یارمەتی فەرەنسیەکان لەدژی کوردانی راپەڕیوی ناوچەی عامودا بدات. بۆیە کەرتە سەربازیەکەی فەرەنسا توانی دەست بەسەر مەڵبەندی شارۆچکەی عامودا بگرێت، ئەوەش دوای ئەوەی هەندێ سەرباز لەو پێکدادانانەی، کە لەدەوروبەری شارۆچکەکە رویدا، لەدەستدا، بەڵام کوردان توانیان دوای بڕینی رێگەی کۆمەکی پێشبینیکراو(رێگەی قامیشلی-عامودا)، گەمارۆی هەمو کەرتەکە بدەن. کوردان توانیان کۆمەڵێك چونە ناوەوە بۆنێو هێزە فەرەنسیە گەمارۆدراوەکە ئەنجام بدەن و هەرچی پێیان کرا لێیان کوشتنو دەسکەوتیان لێگرتن.

لەم بەرەنگاریەدا هێزی کوردیی دیکە لەباکور لەرێگەی سنوری ناوچەی کەمالیەو کوبانی(خانکە)و جەوهەریەوە پەیوەندیان بەراپەڕیوانانەوە کرد، بەوەش کوردان توانیان دەست بەسەر پاشماوەی ئەو هێزە فەرەنسیەی، کە لەعامودا مابۆەوە بگرن. راوێژکاری سەربازی فەرەنساش لەقامیشلی پەیگیری ناردنی یەکەی چەکداری لەسوارە(مەبەست چەکداری ئەسپ سوارە- وەرگێڕ-)، بۆهێرشکردنە سەر عاموداو گوندەکانی دەوروبەری دەکرد، بۆئەوەی دانیشتوان واهەست بکەن هێشتا عامودا لەژێر داگیرکاری

هێزەکانی فەرەنسادایەو ئازاد نەبوە، بەڵام هێزەکـانی سـەعید ئاغـای دەقـوری توانیـان شکسـت بـەهێزە فەرەنسیەکە لەناوچەکە بهێنن.(28)
ڕاوێژکـاری حکومـەتی فەرەنسـا لەناوچەکـە ناچـار بـو داوای کۆمـەکی سـەربازی لـەمفـوەزی سـامی، کـە لەبـەیروت دادەنیشـت بکـات، بۆیـە ئـەویش فڕۆکـەی بۆدامرکاندنـــەوەی ڕاپەڕینەکـــە لـــەعامو‌داو ناوچـــەی قامیشــــلی نــــاردو بەشــــێوەیەکی وەحشــــیگەرانە بۆمبارانی ڕاپەڕینەکەیان کـرد، بەوهۆیـەوە ژمارەیـەکی گـەورە کـوژران‌و بەسـەدەها کەسـیش لەدانیشـتوان بریـنـــداربون(29)و زۆربـــەی گونـــدەکانیش وێرانکـــران. ســــەعید ئاغــــاش وای بەباشــــزانی لەترســــی بەردەوامبونی جێبەجێکردنی کوشتارگە بەکۆمەڵـەکان لەلایـەن فەرەنسـیەکانەوە واز لەسـەرکردایەتیکردنی ڕاپەڕینەکــە بهێنــێ‌و پێویســتی ڕاگرتنــی پرۆســە سەربازیەکانیشـــی بەســـەرکردە هاوپەیمانـــەکانی ڕاگەیانـد. بۆیـە سـەعید ئاغـا پـەنای بـردە بـەر چیـای شـنگار، لەکاتێکدا ڕاپەڕینەکە بەشـێوەیەکی زۆر بـەرەو ڕۆژئـاوا ، تـاوەکو سـەری کـانی(راس العـین)درێـژ بـو بـوەوە، بـەجۆرێ کـار گـەیشـتە ئـەوەی (جاجـان)ی ڕاوێژکـاری حکومـەتی فەرەنسـا لەگونـدی سـەفەح کوژرا.(30)

# پێنجەم: ساڵەکانی ژانگرتن

ئەم باسە دو بڕگە لەخۆدەگرێت، یەکەمیان بۆ رونکردنەوەی رێکنەکەوتنی ریش سپی‌و پیاو ماقوڵانی کورد لەسەر دواڕۆژی کوردستانی ژێر دەستی داگیرکاری فەرەنسا تەرخانکراوە، بڕگەی دوەمیش بۆپەرەسەندنی هزری سیاسی لەسوریاو هەڵوێستی کورد لێی تەرخانکراوە.

# پەرتەوازەیی کورد

سەرەڕای ئەوەی دەسەڵاتدارانی فەرەنسا سیاسەتێکی دیاریکراویان بەرامبەر بەگەلی کوردی ملکەچی داگیرکاری خۆیان نەبو، ئەم گەلەش بۆخۆی‌و لەنێوخۆیدا بۆسەر ئاینی جۆراوجۆرو هۆزو خێڵی جیاواز دابەشبو بو. ئەمە جگە لەوەی هەندێ لەریش سپی‌و پیاو ماقوڵانی کورد مامەڵە کردن‌و هاریکاریان لەگەڵ فەرەنسیەکان رەتکردەوە. بۆیە لەکۆتایی ساڵی 1939 سەرۆکی هۆزی میرسینی(عەبدی خلو) لەسەر داوای راوێژکاری حکومەتی فەرەنسا لەناوچەکەو سەرۆکی دەزگای سیخوڕی سەربازی فەرەنسا بۆلای قەدری بەگ جەمیل پاشای میللی لەگوندی تعلکی، کە کەوتۆتە رۆژئاوای دەرباسیە رۆیشت‌و داوای لێکرد هاوکاری فەرەنسیەکان بکات، قەدری پاشایش وەڵامیدایەوەو پێی وت:"من کوڕی گەلێکی ستەملێکراوم‌و لەستەمی فەرمانڕەوایانی تورك هەڵهاتوم، چەوساندنەوەی داگیرکاری دژی گەلان دەزانم، بۆیە چۆن دەتوانم رێگە بەخۆم بدەم، هاوکاری حکومەتێکی بیانی بکەم، کە وڵاتەکەمی داگیرکردوە".(31)

دوای ئەمە دانیشتوانی گوندی تعلکی‌و بەتایبەت قەدری بەگ‌و لایەنگرانی توشی گرتن‌و دورخستنەوە بونەوە. ئەمەش ئەوەمان بۆ روندەکاتەوە، کە لە نێوەندە هۆزایەتی‌و گوندیەکانی کورد لەو ناوچەیە

یەکدەنگیو ڕێکەوتن دەربارەی سەربەخۆییو رزگاری نەبوە.
فەرەنسیەکان دواتر رویانکردە رۆشنبیرانی کورد، ئەوانەی کەهەرگیز جگە لەکۆمەڵێکی بژاردە، هیچ کۆرو کۆبونەوەیەکی تریان پێکنەهێناوە، ئەو گروپە بژاردەیەش هەردو برا(جەلادەت بەدرخانو کامەران بەدرخان بەگ) سەرکردایەتیان دەکردو ئەمانیش لەناوچە کوردیەکان نیشتەجێ نەبون، بەڵکو لەبەیروتو دیمەشق بون. ئەگەر خێزانو بنەماڵەی بەدرخانیەکان لەرابردودا توانیبێتیان جوتیارانو سەرکردەکانیان لە دژی دەسەڵاتدارانی تورکیا راپەڕێنن، ئەوا لەم قۆناغەدا ئەم بنەماڵەیە جگە لەچالاکی بزاڤی روناکبیری لەنێوان کوردانی ژێر داگیرکاری فەرەنساو کار ئاسانیکردن لە بڵاوکردنەوەی هۆشیاری نەتەوایەتی لای کوردان نەیانتوانیوە شتێکی تر بکەن. هۆکاری ئەمەش بۆئەوە دەگەڕێتەوە، کەبەدرخانیەکان خاوەنی پێگەی ئابوریو کۆمەڵایەتی بەهێز نەبون لەناوچە کوردیەکانی سوریا، ئەو هۆزەش کەئەم خێزانو بنەماڵەیە دەگەڕێنەوە سەری واتە هۆزی(ئازیزان)، لەو قۆناغەدا خێڵێکی تر، کەخێڵی بنەماڵەی حاجی دەروێش بو، سەرکردایەتی دەکرد، نەك بەدرخانیەکان خۆیان. ئەگەرچی جموجوڵو چالاکی بەدرخانیەکان بەپلەی یەکەم پشتی بەهاوکاری هەندێ لەروناکبیرانی کوردو ریش سپی کوردو ئەرمەنو دەسەڵاتدارانی

فەرەنساو ئینگلیز دەبەست،(32) ئەوا بەرژەوەندی هاوپەیمانان(لێرەدا مەبەست فەرەنساو ئینگلیزە-وەرگێڕ-)، وایدەخواست کوردان لەپێناوی وەدیهێنانی مەرامو بەرژەوەندیەکانی خۆیان لەکاتی جەنگی دوەمی جیهانیدا سازو ئامادە بکەن، ئەوەش بەیارمەتی بڵاوکردنەوەی هەواڵو پروپاگەندە لەنێوان کوردان بەزمانی کوردیو فەرەنسی. بۆیە بەدرخانیەکانو هاوڕێکانیان توانیان تائاستێك ئەم مەبەستە بۆهاوپەیمانان وەدیبهێنن.(33) ئەوەش بێئەوەی لەسەر حسابی بەرژەوەندی نەتەوەیی بێت. باشبونی پەیوەندی نێوان هەندێ لەکوردانو فەرەنسیەکانو دزەکردنی هەواڵی هەستانەوەی جوڵانەوەی نەتەوایەتی کورد لە رۆژهەڵاتو باشوری کوردستان، کار ئاسانیکردو بو بەهۆی تورەبونی سەرۆکی هۆزە عەرەبیەکان، بەتایبەتیش زۆربەی ئەو سەرۆك هۆزە عەرەبیانە دوای ئەوەی لەسەرەتای داگیرکاری ناوچەی جەزیرە لەلایەن فەرەنساوە لایەنگریان بون. ئەم پێشهاتانە وایانکرد ئەم ریش سپیو پیاو ماقوڵانەی هۆزە عەرەبیەکان روبکەنە هاوپەیمانێتی بەستن لەگەڵ دەسەڵاتدارانی بنەماڵەی هاشمی لەعێراق، کە لەڕوی مێژوییەوە پەیوەندی پتەویان بەدەسەڵاتدارانی ئینگلیزەوە هەبو، داواشیان کردبو(واتە بنەماڵەی هاشمی-وەرگێڕ-) سوریا بخرێتە سەرتەختی عێراق یان یەکێك لەنەوەکانی حسێن وەك پاشا لەسەر سوریا دابنرێت.

ئەو ئاراستەی دوایی زۆربەی هـۆزە عەرەبیـەکان، کـە لەباشــوری ناوچــەی جــەزیرە بــون، یــاخود ئەوانــەی توانیبویـان لـەژێر چـەتری هێزەکـانی فەرەنسـادا بێنـە ناوچەی جەزیرەوە، لەزیادکردنی رادەی گرژی لەناوچە کوردیەکاندا کار ئاسانیانکرد.

# هەڵوێستی کوردانی دەرەوەی کوردستان

(4)

پەرەســـەندنی سیاســـی لای كـــوردانی دەرەوەی کوردستان گرێدرابو بەپەرەسـەندنی هـزری سیاسـی لەکوردسـتان لەلایـەكو هـزری سیاسـی گۆڕەپـانی سـوریا لەلایـەکیترەوە. لـەکاتی داگیرکـاری فەرەنسـا لەسـەر سـوریا، ئـەو وڵاتـە سـێ ڕەوتـی سیاسـی بنەڕەتی بەخۆوەبینی، ئەوانیش: ڕەوتـی شـیوعیەتو نەتەوایەتیو ئاینی بون.

**یەکەم- ڕەوتی شیوعیەت:**

حزبـی شـیوعی سـوریاو(لوبنـان) لەسـاڵی 1924 دامـەزرا. لـەمانگی شـوباتی 1928 ڕێکخـراوی حـزب لەدیمەشق پێکهێنراو خالیـد بەگـداش لەسـاڵی1930 لەڕێگـەی کـوردێکی تـرەوە، کـەبریتی بـو لەفـەوزی زەعیم کوڕی یەکێك لەسەرۆکە سوریەکان، (حوسنی زەعـیم) چـوە نێـو حزبـی شـیوعیەوە. ئـەم حزبـە بەخێراییـەکی زۆر لـەنێوان دانیشـتوانی ناعـەرەبو نامسـوڵماندا بڵاوبـۆوە. لەسـەرەتای سـاڵی 1931 ئەندامە نوێیەکانی ئەم حزبە بەشێوەیەکی بنـەڕەتی لەگەڕەکی(حی الاكـراد)(34) لەدیمەشـقو هـەروەها لەشاری حەما دەهاتنە نێویەوە. کوردان بەشێوەیەکی

کــارا لەســەرکردایەتی ڕێکخــراوی حزبــی شــیوعی لەماوەی نێوان هەردو جەنگی جیهـانی یەکـەمو دوەم بەشداریان کـردو نـاوی زۆر لەوانـە لـەژیانی سیاسـی لەشاری حـەما لەنمونـەی محەمـەد ئەلعـەلیو جگـە لەوانیش دەرکەوتن.(35)

**دوەم- ڕەوتی نەتەوەیی عەرەبی:**

لـەماوەی نێـوان هـەردو جـەنگی جیهانیـدا تـەوژمی نەتەوەپەرســتی عــەرەبی چـالاك بــو، دوای ئــەوەی هەستی نەتەوەپەرستی عـەرەبی چـالاك بـو، پـێشو لەکاتی جەنگی یەکەمی جیهانیدا بـەهۆی کۆمـەکی هاوپەیمانانـەوە ژیایـەوە. ئـەم هەسـتە بەشـێوەیەکی گشـــتی بۆئایـــدۆلۆژیای بـــژاردەی عـــەرەبی دژی هاوپەیمانان گۆڕا. لەگەڵ هاتنی فاشیزمو نازیزمیشدا لەئەوروپا، بیرۆکەی ئەتنی(مەبەست بیرۆکەی رەگەز پەرســتیە-وەرگێــڕ)خــاکێکی بــەپیتی بۆخـۆی لــەنێوان نەتەوە پەرسـتانی عـەرەب دۆزیـەوەو لـەپێناوی سـازو ئامـــادەکردنی ئەوانـــەی، کەبەعـــەرەبی قســـە دەکــەن(العربوفــون) دژی هاوپــەیمانان(مەبەســـت لەهاوپەیمانان فەرەنساو بەریتانیاو یەکێتی سۆڤیەتی جارانە، کە لـەدژی فاشـیزمو نـازیزم چونـە جەنگـەوە- وەرگێـــڕ-) بـــەکاریان هێنـــا. بەمـــەش ڕێکخســـتنە نەتــەوەییو رەگەزپەرســتیەکان لــەنێوان رونــاکبیرانی عـەرەب لەسـوریا ژیایـەوەو لـەدایکبو. ئـەو ڕێکخسـتنە نەتەوەییانەش، کەرۆڵێکی گرنگیان لەژیانی سیاسـی لەسوریا گێڕا، بریتی بون لە:

**1- کۆمەڵەی کاری نەتەوەیی:**

ئـەو بزوتنەوەیـە بـو، کـە لەبیرۆکـەی نەتەوەپەرسـتی عەرەبیـەوە دەرچـو. زۆربـەی ئەندامـەکانی لـەچینی فێرکەرانو خوێنەوارانی نەوەی بۆرژوا هەڵکشـاوەکانی شـارەکان بـونو دروشـمی سـەربەخۆیی سـوریایان لەپێناوی سازکردنی دەنگدەران، لەو هەڵبژاردنەی کـە لـەکاتی داگیرکـاری فەرەنسـا بەسـەر سـوریاوە ئەنجامدەدرا، بەکار دەهێنا،. ئەو بزوتنەوەیە بریتـی بـو لـەزۆرترینی ئـەو رێکخسـتنە سیاسـیە سـورياييانەی ساڵانی سیەکان، کە لەچـەمکی پـارتی سیاسـیەوە نزیکبو.(36)

**2- کوتلەی نیشتمانی:**

بریتی بو لەو تەکەتولەی، کەهاوپەیمانێتیەکی لەنێوان گـەورە دەوڵەمەنـدانو گـەورە بـۆرژوا بازرگانـەکانی شارەکانی سوریا بەرجەستە کـرد بـو. ئـەم تەکەتولـە سیاسیە بناغەیەکی رێکخراوەیی جێگیری نەبو.

هاوپـەیمانێتی کۆمەڵـەی نەتـەوەیی لەگـەڵ کوتلـەی نیشتمانی فشارێکی کرداری لەسـەر دەسـەڵاتدارانی داگیرکـاری فەرەنسـا پێکهێنـابو. بـەجۆرێ ئـەم هاوپەیمانێتیـە تـەنازولکردنی راسـتەقینەی لەلایـەن فەرەنسـاوە وەدیهێنـا، ئـەوەش بەپێـدانی مـافی خۆرێبەری(حکم الذاتی) بۆسوریا بەشێوەی دەوڵـەتی سـەربەخۆ لەسـاڵی 1936.(37) بـەڵام ئـەم دەسـتکەوتەی کەسـەربەخۆ خوازەکـان وەدەسـتیان هێنابو لەبەر چەند هۆکارێك درێژەی نەکێشـا، لەوانـە:

دوژمنایـــەتی هێـــزە ســـەربەخۆ خوازەکـــان لەگـــەڵ یەکتری‌و سازشکردنیان لەگـەڵ داگیرکـەرو بێتواناییـان لەروبەڕوبونـەوەی مەسـەلەی ئەسـکەندەرونە. بۆیـە ســـەربەخۆیی دیـــاریکراوی ســـوریا لەســـاڵی 1938 کەوت.

**3- حیزبی نەتەوەیی سوریا:**

ئەم رێکخستنە لەسـەر بیرۆکـەی پێکهێنـانی سـوریای گەورە بەرپابو. زۆربەی سـەرکردەکانی ئەم رێکخسـتنە لەســوریا لەمەســیحیەکان بــون. حزبــی بەعســی سۆسیالیســتی عــەرەبی ئەمــەیان(وەك ئایــدۆلۆژیاو رێکخســـتن‌و ئاراســـتەیەکی سیاســـی دانـــابو، وەك وەڵامدانەوەی نـازیزم‌و فاشـیزم)، ئـەو دو رەوتـی، کـە لەو ماوەیەدا لەئەڵمانیاو ئیتالیا دەستیان بەهەڵکشان کردبو.(38)

ئــەو ســێ رێکخســـتنە ئومێــدی گــەورەیان بــەهێزی ئەڵمانیای مەزنەوە هەڵواسیبو. لەگەڵ هەڵگیرسـانی جـەنگی دوەمـی جیهانیشـدا ئـەو سـێ رێکخسـتنە گرەویـــان لەســـەر شکســـتهێنانی پێشـــبینیکراوی فەرەنسا لەپێناوی سەربەخۆیی سوریا دەکرد.

**4- بزوتنەوەی بەعسی عەرەبی:**

بزوتنـــەوەی بـــەعس هەنـــدێ جیـــاوازی لەســـێ رێکخستنەکەی پێشو هـەبو. ئـەو بزوتنەوەیـە لەسـەر بیرۆکـەی زیندوکردنـەوەی نەتەوەپەرسـتی عـەرەبی‌و زیادەڕەویکردن لەپێگەی عـەرەب بـەرپابو بـو. ئامـانجی ئـەم بزوتنەوەیـە راکێشـانی جوتیـاران بـو بۆتەنیشـتی

بزوتنەوەکـە. هـەروەها تـوانی هەنـدێ بیروبۆچـونی چاکســـازی کۆمەڵایـــەتی بونیاتبنێـــت، بـــەوەش نمونەیـــەکی وەرگیـــراوی حزبـــی سۆسیالیســـتی نەتـەوەیی نـازی بـو، کەدامەزرێنـەرانی بەعســیزمی یەکەمین، لەنمونەی (زەکی ئەرسۆزیو سـەلاحەدین بیتــارو میشــیل عەفلــەق) گواســتبویانەوەو ئەمانــە خوێنـدنیان لەفەرەنسـا تـەواو کـرد بـو. کەوتبونـە ژێـر کاریگـەری فەلســەفەی نەتەوەپەرســتی ئــەڵمانیو هـــزری ئایدیالیزمیـــەوە.(39) یەکـــەم رونکردنـــەوەو بەیاننامەی بزوتنەوەی بەعس لـە24ی تـەموزی 1943 دەرکراو تیایدا هاتبو:

- نوێنەرایـەتی گیـانی عـەرەبی لـەدژی مارکســیزمی مادی دەکەین.

- نوێنەرایـــەتی مێـــژوی زینـــدوی عـــەرەبی دژی کۆنەپەرستی مردوو پێشکەوتنی دروستکراو دەکەین.

- نوێنەرایــەتی نەتەوەپەرســتی تــەواوی عــەرەبی دەکەین، کەگوزارشــت لەوەدەســتهاتوی تاکەکەســی دەکات.

- دژی نەتەوەپەرستی زارەکین، کـەزمان تێناپـەڕێنێتو سەرجەم رەفتارەکان پێچەوانەی دەوەستنەوە.

- نوێنەرایـــــەتی پـــــەیامی عـــــەرەبچێتی دژی بەپیشەکردنی سیاسەت دەکەین.

- نوێنەرایەتی نەوەی نوێی عەرەبی دەکەین.(40)

کۆنگرەی دامەزراندنی یەکەمی بزوتنـەوەی بەعســی عــەرەبی لــەنێوان(4-7ی نیســانی 1947) بەســتراو

دوای ئــەوە بــو بــەحزبێکی سیاســیو نزیکــەی 200 ئەنــدام لەئاراســتە ئایدۆلۆژیــە پێکــەوە نــەگونجاوەکان ئامــادەی کۆنگرەکــە بــون، کــەدەکرێ بەمشــێوەیەی خوارەوە لەسێ رەوتدا پۆلێنیان بکەین:

**ئەلف- رەوتی لیبراڵی:**

ئـەم تەوژمـە لەلایـەنگرانی دامەزرانـدنی دەوڵـەتێکـی عــەرەبی بــون، کــە لەســەر بنــەمای سیســتمی دیموکراتی بۆرجـوازی رۆژئـاوایی بـەرپا ببێـتو لەسـەر بنەمای دەسـتورێك بێـت، کـەبڕیار لـەفرە حزبـیو فـرە نەتەوەیی بداتو بڕوای بەخاوەندارێتی تایبەتو میرات هـەبێت. لایـەنگرانی ئـەم رەوتـە وایانـدەبینی دەبـێ بزوتنەوەیــەکی نەتەوەپەرســتی عــەرەبی نــوێ بـەردەوامی مێـژوی عـەرەبیی ئیسـلامی بێـت بـەبێ رەچاوکردنی گیانی سەردەم.(41)

**بێ- رەوتی نەتەوەیی رەگەزپەرستی:**

ئــەم رەوتــە بەشــێوەیەکی زیــادەڕەوی لەســەر جەختکردنــەوە لەرایــەڵی نەتــەوەییو لەســەر جیاکردنـەوەی نـەتـەوەی عـەرەب لەنەتـەوەکانی تـر دەرکــەوت. بــەهۆی تایبەتمەندێتیــە شارســتانیو رەگەزیەکانـەوە، ئـەم تایبەتمەندێتیانـە وا لەنەتـەوەی عــەرەب دەکــات پلەیــەکی جیــاوازتری لــەوانی تــر هەبێت.(42)

**جیم- رەوتی چاکسازی:**

لایــەنگرانی ئــەم رەوتــە پێیــان لەســەر پێویســتی دامەزرانــدنی دەوڵــەتێکی عــەرەبی، کەهەســتێ

بەئەنجامدانی گۆڕانکاری کۆمەڵایـەتی لەبەرژەوەنـدی زەحمەتکێشـانی عـەرەب بۆراکێشـانیان بـەرەو کـاری سیاســی دادەگــرت. بۆئــەوەش داڕێژەرانــی بیــری بەعســـیزم ئـــەم ئاراســـتەیان ناونـــاوە رەوتـــە نەتەوەپەرســـتی سۆســـیالیزمی.(43) کـــۆنگرەی بزوتنەوەی بەعسی عەرەبی بڕیاری لەسەر دەستورو پـــەیڕەوو پرۆگرامـــی نـــاوخۆیی حـــزب داو راگـــرو دەستەیەکی جێبەجێکردنیشی بۆحزب هەڵبژارد، کە لەســێ ئەنــدام پێکهــاتبو. دەســتور ســێ بنــەمای بنەڕەتی لەخۆگرتبو، ئەوانیش:

1- یەکێتی نەتەوەی عەرەب.
2- کەسایەتی نەتەوەی عەرەب.
3- پەیامی نەتەوەی عەرەب.

هەردو ئاراستەی لیبراڵیو نەتـەوەیی رەگەزپەرسـتی نێو بزوتنەوەی بەعسی عەرەبی کاریگـەری گـەورەیان لەنێو حزبی بەعسدا هەبو.

**سێیەم- ڕەوتی ئیسلامی:**

لەگـەڵ هەڵوەشـانەوەی ئیمپراتۆریـەتی عوسـمانیو هاتنـە نـاوەوەی هاوپـەیمانان بۆناوچەکـە(لێـرەدا مەبەست لەهاوپەیمانان بەریتانیاو فەرەنساو تاساڵی 1917و سەرهەڵدانی شۆڕشی بەلشەفیك روسیایە، کـە لەجـەنگی یەکـەمی جیهانیـدا پێکـەوە لـەدژی دەوڵـەتی عوسـمانیو ئـەڵمانیاو نەمسـاو مەجـەر هاوپـەیمان بـون- وەرگێـڕ-)، هەنـدێ بزوتنـەوەی ئیسـلامی سیاسـی پشـت بەسـتو بەدژایـەتیکردنی بیرۆکـەی خۆرئـاوایيو مەسـیحی بوژانـەوە، کەپشـتگیری دژایـەتیکردنی بیرۆکـەی دامەزرانـدنی رێکخسـتنی نەتـەوەییان، بـەو ئیعتیبـارەی فاکتەرێکـە بۆدابەشکردنی نەتەوەی ئیسلامی دەکرد.

رێکخسـتنە ئیسـلامیە عەرەبیـەکان پارێزگاریـان کـردو هەمیشـەش پارێزگـاری دەکـەن لـەو شـەقڵە نەتەوەییەی، کـە لەپێگـەی عـەرەبو زمـانی عـەرەبی تایبەتمەنـد لـەهزرو مێـژوی ئیسـلامیەوە دەرچـوەو بانگـەواز بۆدوبـارە داڕشـتنەوەی سـەروەری ئیمپراتۆریەتی عەرەبی ئیسلامی دەکاتو داوا دەکات رێکخسـتنە ئیسـلامیەکان لەڕێگـەی پڕوپاگەنـدە نەتەوەییەکانیانـەوە رکابـەری ئـەو رێکخسـتنە سیاسیانە بکـەن، کـەخاوەنی ئایـدۆلۆژیای نەتـەوەیی عـەلمانین، لەکاتێکـدا رێکخسـتنە نەتەوەییـە عەرەبیەکان لەرابردو لەئێستاشدا بەردەوام رکابەرێتی ئیسـلامیەکان لەسـەر زەمینـی ئیسـلام دەکـەنو

وادادەنـــێن ئیســـــلام پایەیــــەك لەپایـــەكانی نەتەوەپەرســتی عەرەبیــەو بەشــێكە لەمێژوەكــەی، بــەڵام ركابــەرێ‌و ململانــێ لــەنێوان رێكخســتنە نەتەوەییــە عەرەبیــەكان لەلایــەك‌و رێكخســتنە ماركسیســتیە عەرەبیــــەكان لەلایـــــەكیترەوە لەدەوروبــەری هــەردو زەمینــەی كۆمەڵایــەتی‌و نەتــەوەیی دەســورێتەوەو زۆربــەی رێكخســتنە نەتەوەییــەكانیش بانگەشــەی بیرۆكــەی چاكســازی دەكــەن‌و دروشــمی سۆســیالیزمی بــەرز دەكەنــەوە، بۆئەوەی جەماوەری زەحمەتكێش لەتەنیشتی خۆیان كۆبكەنەوەو ركابەرێتی ماركسیستەكان لەسەر رێسا كۆمەڵایەتیــەكان پێبكــەن. لەكاتێكــدا رێكخســتنە ماركسیســــتە عەرەبیــــەكان بانگەشـــــەی سەركردایەتیكردنی بزوتنەوەی شۆڕشگێڕی عەرەبی دەكــەن‌و بانگــەوازی دامەزرانــدنی یــەك دەوڵــەتی عــەرەبی دەكــەن، ئــەوەش بــۆداڕنینی رێكســختنە نەتەوەییە عەرەبیەكان لەپاساوی بونیان.

كــوردانی شـــارەكانی ســـوریا، بەتایبــەت شـــاری دیمەشق‌و حەلەب‌و حەما بەشداریان لەدامەزرانـدن‌و چـالاكی ســەرجەم رێكخســتنە سیاســیەكانی نێــو ســوریا بەهــەمو ئاراســتەكانیانەوە كــردوە، بــەوەش كوردان توانیان رۆڵێكی دەركەوتو لەسەركردایەتی ئـەو رێكخستنانەدا بگێڕن.(44) بـەڵام بەسیفەتی ئـەوەی كەسوریاین، نەك وەك نوێنەرانی گەلی كـورد. لەگـەڵ ئـەوەی حزبـی شـیوعی سـوریا داوای هـیچ مـافێكی

نەتەوەیی بۆکوردان نەکردبو، هەروەك چۆن پێشترو ئێستاش عەرەب ئەوەی نەکردوە،(45) بەڵام پرەنسیپە گشتیەکانی مارکسیزم، کەبانگەشەی یەکسانی چینایەتی‌و نەتەوایەتی دەکات، ئومێدێکی بەکوردان بەخشیبو، هەروەها هانیشیدا بون بۆئەوەی بچنە ریزی ئەو حزبەوەو تیایدا ببنە ئەندام. لەماوەی سەرەتای دامەزراندنی حزبەوە تاوەکو ئێستاش کوردان بەشێوەیەکی کارا لەبزوتنەوەی مارکسیزمدا لەسوریا بەشداری دەکەن.
لەگەڵ ئەوەی کەسایەتیە نەتەوەییەکانی کورد لەشارە گەورەکانی سوریا دیسان ئەوانیش بۆسەر لایەنگرو دژی دەسەڵاتدارانی فەرەنسا دابەشبو بون، بەڵام هەندێ وتاری بڵاوکراوە لەگۆڤاری(روناهی) ئاماژە بۆپەیوەندی باشی نێوان هەندێ لەبەرپرسە سەربازیەکانی فەرەنساو کوردانی دیمەشق دەکەن.(46) بەگوێرەی وتەی خالید بەگداش فەرەنسیەکان دان بەتایبەتمەندێتی کۆمەڵگەی کوردیدا دەنێن‌و رێز لەپێلایەنی گەڕەکی(حی الاکراد)ی دیمەشق دەگرن‌و رێزو پیرۆزی ئەو گەڕەکە پێشێل ناکەن، تەنانەت ئەگەر شۆڕشگێڕانیش بچنە ناویەوە.(47) لەکاتێکدا(رمی شێخۆ فەرحە)، کەسەرکردەیەکی کوردی ترە لەبزوتنەوەی مارکسیزمدا، هەندێ شەڕی کرداریمان بۆدەگێڕێتەوە، کە لەنێوان کوردو سەربازە فەرەنسیەکان لەم گەڕەکە کوردنشینەدا رویداوە، بەتایبەت لەسالانی(1925-

1926)، كاتێـــك كـــوردان بـــەرگریان لەســـەربەخۆی گەڕەکەکـەیان دەکـردو ئـەو جەنگانـەش ڕەنگدانـەوەی لەســـەر پانۆرامــای ڕوداوەکــان لەکوردســـتانی ژێـــر دســەڵاتی داگیرکـاری فەرەنســا هــەبو.(48) لـەنێوان گەنجـــە نەتەوەییـــەکانی گـــەڕەکی(حـــی الاکـــراد) لەدیمەشق و لەنێوان ئەوانیتردا ناوی(ئەحمەد باراقی) دەبینـین، کـەخاوەنی جـەماوەرێکی بـەهێز بـوەو دژی دەسەڵاتدارانی فەرەنسا بوە، سـەرەڕای نزیکـی لـەو کۆمەڵە روناکبیرە کوردەی، کە لەگەڵ فەرەنسـیەکاندا هاوپـەیمان بـونو لەلایـەنگرانی نوســەرو شــاعیری کورد(ئوسمان سـەبری) بون، کە لەو گەڕەکەدا تـاوەکو کۆچی دوایکرد، مایەوەو نیشـتەجێبو.(49)

# بوژانەوەی هزری نەتەوایەتی کورد

(5)

ئـــەم توێژینەوەیـــە کـــات‌و شـــوێن یـــان بـــارودۆخی لـەدایکبون‌و پەرەسـەندنی هەسـت‌و هـزری کەسـە نەتەوەییـەکانی کـورد بەشـێوەیەکی گشـتی‌و ورد لــەخۆناگرێت، چونکــە ئــەم بابەتــە پێویســتی بەتوێژینـەوەی زۆر قـوڵ هەیـەو ئـەم باسـە هەوڵێکـە بۆخســتنەڕوی ســەرەتاکانی جوڵانــەوەی نەتــەوەیی لای کوردانی ژێر دەسەڵاتدارانی ئێستای سوریا.

زانـراوە کوردسـتان تـاوەکو سـەدەی بیسـت(لـەنێوان ئیمپراتۆریەتی عوسمانی‌و ئێران) بۆدو بەش دابەشـبو بـو. کـوردان زۆرجـار تـەنها مەگـەر بەشـێوەی روکـەش نەبێت، ملکەچی دەسەڵاتی ناوەند نـەبون. هەسـت‌و هۆشیاری ئینتیما بۆیەك نەتەوە لای کـوردان لـەمێژودا زۆر دورە(50)، بــەڵام ئــەوەی لەســەری رێکــەوتون، ئەوەیە، کەبزوتنـەوی نەتـەوەیی‌و رێکخـراو(مەبەسـت لـەو بزوتنـەوە نەتەوەییانـەی کـوردە، کەبەشـێوەیەکی سیستماتیزەکراو ئاراستەکراون‌و سەرکردەیان هەبوەو زیـاتریش مەبەسـت شـۆڕشـەکانە-وەرگێـڕ) لـەکۆتایی ســەدەی 19و ســەرەتای ســەدەی 20 لەســەر پاشماوەی هەڵوەشانەوەی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی

دەســـتیپێکردوە.(51) گرنگتـــرین ئـــەو بارودۆخانـــەی کاریگـــەری لەســـەر هەســـتی نەتەوایـــەتی کـــوردو پەرەســـەندنی لای کـــوردانی نێـــو ئیمپراتۆریـــەتی عوسمانی هەبوە، بریتی بون لە:

1-هەســتانەوەی بزوتنــەوەی نەتەوایــەتی عــەرەبیو بانگـــەوازەکانی بۆبوژاندنـــەوەی ئیمپراتۆریـــەتێکی عەرەبی ئیسلامی نوێ.

2- بڵاوبونــەوەی نفــوزی رۆژئــاوا لــەنێو ئیمپراتۆریــەتی عوســـمانیو رەواجـــدان بەبیرۆکـــەی دەوڵـــەتی نەتــەوەیی، بەتایبــەت لــەکاتی جــەنگی یەکــەمی جیهانیدا، بەشێوەیەك ئامانجی بنەڕەتی هاوپەیمانان هەڵوەشاندنەوەی ئیمپراتۆریەتی عوسمانیی بـو، کـە لەوکاتەدا هاوپەیمانی ئەڵمانیا بو.

3- لــەدایکبونی بزوتنــەوەی نەتەوەپەرســتی تــورك، کەبانگەوازی بۆدامەزرانـدنی ئیمپراتۆریـەتێکی تـورکی تـۆرانی ناعوسـمانی دەکـرد(مەبـەسـت لەدەوڵـەتی نەتەوەییـــە لەســـەر بنـــەمای ئـــەتنیو رەگـــەزی، کەچوارچێوەیـــەکی فراوانتـــری هەیـــەو تورکـــان لـــەو قۆناغەدا بایەخیان پێدا-وەرگێڕ).(52)

4- ســـەرکەوتنی شـۆڕشـــی بەلشـــەفیو جـــاڕدانی پرەنســـیپی مـــافی گـــەلان لـــەبڕیاردانی چارەنوســـی خۆیان،(واتە مافی چارەی خۆنوسین-وەرگێڕ).

5- پەرەســـەندنی ئـــابوری، کەرەوشـــی کۆمەڵایـــەتی ناگونجـــاو لەگـــەڵ رێکخســـتنی کۆمەڵایـــەتی دەرەبەگایـەتی خـاوەن شــەقڵی هۆزایـەتی هێنابویـە

ئاراوەو ئەو گۆڕانكاریانەی قۆناغەكە چوارچێوە گـەلێكی سەپاند، كەلەگەڵیدا بگونجێت.
بـەكورتی بـارودۆخی ئـەو كـاتو قۆناغـەی دەوڵـەتی عوســمانی پاڵنــەر بــو بــۆ گەشــەكردنی هەســتی نەتەوایـــەتی لای زۆربـــەی نەتـــەوەكانی نـــاو ئیمپراتۆریــەتی عوســمانی. بۆیــە كــوردانیش وەك نەتەوەكانی تر خۆیان رێكخستو كۆمەڵەی سیاسیان پێكهێنـــا، بـــەڵام نـــەیانتوانی ئـــەوەی، كـــەبژاردەی نەتـــەوەكانیتر لەقـــەوارەی سیاســـیدا وەدییانهێنـــا، كــەزۆرجار لەســەر حســابی نەتــەوەی كــورد بــوە، ئـەمانیش وەدیبهێـنن. باوەڕوایـە هۆكـاری سـەرەكی لەوەدا بۆئەوە بگەڕێتەوە، كەهاوپـەیمانان وایانـدەبینی كوردان بەر لەجەنگی یەكەمی جیهـانی هاوپـەیمانی توركــان بــون، بۆئەمــەش لەســەرەتاوە پەیوەنــدیان بەعەرەبەوە كردو كۆمەكو هاوكاریان بۆراپەڕین لـەدژی بـابی عـالی عوسـمانی كـرد. دواتـریش هاوپـەیمانان كۆمەكی توركانیان كرد، ئەوانـەی كـە لـەنێو دەسـتیانا بـونو وەك ئـامرازی دەوڵـەتی عوسـمانی مابونـەوەو هیچ بایـەخێكیان بەچارەنوسـی میللـەتی كـورد نـەدا، لەبەرئــەوەی كــورد لەدەوڵــەتی(توركیــا) شــوێنێكی نزمتریان لەچاو توركـدا هـەبو. هـەروەها لەبەرئـەوەش بو، كەتوركان دانیان بەداگیركاری هاوپەیمانان لەسـەر پاشــــــماوەی پارچـــــــەكانی ئیمپراتۆریـــــــەتی عوسمانی(عێراقو وڵاتی شام) نابو.

دوای شکستی یەك لەدوای یەکی راپەڕینی جوتیارانی کوردو بەهۆی پێگەی سیاسی ئەو دەوڵەتانەی کوردستانیان داگیرکرد بو، بزوتنەوەی نەتەوایەتی کورد لەچوارچێوەی رێکخستن‌و دامەزراوەی سیاسی لەهەمو بەشەکانی کوردستان بەگوێرەی ئاستی خۆی چوارچێوەی گرت. بەڵام سەرەڕای سنوره دروستکراوەکان، لەرابردوو ئێستاشدا پەیوەندی‌و رایەڵ لەنێوان سەرجەم پێکهاتە سیاسیە کوردی‌و کوردستانیەکاندا بەدیدەکرێت. لەبارودۆخی مێژویی بەرهەمهاتوی دابەشکردنی دوایی کوردستان‌و بەتایبەت دوای شکستی راپەڕینی دیار بەکرو ئاگری‌و دەرسیم لەباکورو رۆژئاوای کوردستان، هەروەها دوای شکستهێنانی شێخ مەحمودی بەرزنجی‌و داڕوخانی شانشینەکەی لەباشوری کوردستان‌و دوای لەناوبردنی بزوتنەوەی سمایل ئاغای شکاك لەرۆژهەڵاتی کوردستان، هەندێ لەروناکبیرانی کورد بەرەو باشورو رۆژئاوای کوردستان کۆچیان کرد، کەئەوکات لەژێر دەسەڵاتی فەرەنسا بو. ئەم روناکبیرانە کارئاسانیان لەکڵپەسەندنی هەستی نەتەوایەتی گەشەکردو لەنێو جەماوەری جوتیاران کرد، کەبەسەرکردایەتی سەرکردە هۆزایەتیەکانیان رادەپەڕین. لەو ماوەیەداو لەکۆتایی سالانی سیەکان کۆمەڵەو رێکخستنی نەتەوایەتی کورد بەدەستپێشخەری روناکبیران لەهەمو گۆرەپانەکەدا بەنزیکەیی پێکهێنرا.

لەدیمەشق ئوسمان سەبری توانی دوای گەڕانەوەی لەتاراوگــە لەســاڵی 1938 لاوانو گــەنجانی کــورد لەدیمەشــق کۆبکاتــەوەو رێکخــراوی(یــەکێتی لاوانــی کورد) دابمەزرێنێت. ئەو رێکخراوە بایەخی بەمەسـەلە نەتەوایەتیـەکانی کـورد دەداو ئامـانجی ئەندامـەکانی بریتــی بــو لــەوەی رۆژێــك نیشــتمانەکەیان ئــازادو سەربەخۆ ببینن.(53)
لەهـەمان مـاوەدا کۆمەڵـەی نەتەوایـەتی تـر لەهـەمو شـارە کوردیـەکان پێکهێنـرا، لەشـاری دێریـك هەنـدێ لەنەتەوەییـــەکان بۆئـــاڵوگۆڕپێکردنی هـــەواڵی نەتەوایـەتی بەیەکدەگەیشـتن. لەشـاری قامیشـلی مـەلا ئەحمـەدی نـامی ئەڵقـە گـەلێکی نەتەوایـەتی بـەڕێوە دەبـردو لەگـەڵ مـەلا عـەلیو کۆمەڵەکـەی لەگونـدی تـوبز پەیوەنـدی هـەبو، پێکـەوە هاریکـاری یەکتریان لەسەر گۆڕینـەوەی زانیـاری لەگـەڵ کۆمەڵـە نەتەوەییــەکانی تــر لەشــاری عــامودا دەکــرد، کەبەشێوەیەکی بنەڕەتی شاعیر جگەرخوێنو نوسـەر حەســەن هۆشــیار سەرپەرشــتیان دەکـرد. لـەنێوان ئەندامـە دەرکـەوتوەکانی ئـەو کۆمەڵـە نەتەوەییـەدا هەریەکە لە(عەفدی تیللۆو یوسف حاج حرسانو مەلا ئەحەمـدی نـامی) هـەبون، بـەجۆرێك سـاڵی 1938 لەشـاری عـامودا یانەیـەکی رونـاکبیری، کەزۆربـەی نەتەوەییـەکـانی شـارەکەی لـەخۆگرتبو، پێکهـات. لەناوچەی(جبل الاکراد) لاوانـی کـورد، ئەوانـەیان، کـە لەشــاری حەلــەب دەیانخوێنــد، توانیــان کۆمەڵــەی

نەتــەوەیی پێکبهێــنن، کەئەندامــەکانی لــەنێوان(5-11)خوێندکار بو. هـەمو کۆمەڵـەکان هەفتانـە بۆبـاس‌و خواســکردنی کاروبـاری ناوچــەیی‌و نەتــەوەیی کــورد کۆبونـــــەوەیان گرێـــــدەدا. لــــەدیارترین رەگــــەزە نەتەوەییــەکانی نێــو لاوانــی ناوچــەی(جبـل الاکــراد) بریتی بون لـە(عوسـمان محەمـەد، محەمـەد مـەنان، نـوری عـارف، عەبـدوڵلا حەسـەن-عطمانـا-، رەشــید عەبـد-چـەرچی-، ئەحمـەد فیـو، محەمـەد جەعفـەر، شێخ ئیسماعیل، محەمەد عارف معبطلی، مصطفی حــەمو، میرکــان، مــەحمود شــەوکەت نەعســـان، کەبەشـەوکەت حەنان ناسراو بو).
دوای ئــەوەی ئــەم کۆمەڵانــە پەیوەنـدی سیاســی‌و رێکخراوەییان لەگەڵ کۆمەڵە نەتەوەییـەکانی ناوچـەی جەزیرە بەرپاکردو پاش ناسینی هەنـدێ سـەرکردەی بزوتنـــەوەی کـــورد لەنمونـــەی جگــەرخوێن‌و نـــوری دەرســـــیمی، کـــــەدوای راپــــەڕینی دەرســــــیم بەســـەرکردایەتی ســـەید رەزا بۆحەلــەب هــەڵهاتبو، کۆمەڵــەکانی ناوچـــەی(جبـــل الاکـــراد) رێکخـــراوی خوێنـدکاریان بـەناوی(پەیوەنـدی خوێنـدکارانی کـورد) لەساڵی 1946 پێکهێناو ئەو رێکخراوە چالاکی لەسـەر فێربـون‌و فێرکردنــی خوێندنــەوەو نوســین بــەزمانی کــوردی‌و بــەپیتی لاتینــی چڕکــردەوە. دوای ئــەوەی رێکخراوەکە ئەندامی تری نەتـەوەیی وەرگـرت‌و هاتنـە ریزیـەوەو خوێنـدکار نـەبون، بەتایبـەت(رەشـید حـەمۆ، ئیبراهیم قادر، رەشید عەبدورەحمان)، ئەم پەیوەندیـە

خوێندکاریـەی کـورد بۆپەیوەنـدی رونـاکبیرانی کـورد هەڵوەشایەوەو گۆرا. هـەروەها بـەهۆی گەشـەکردنی هەسـتی نەتەوایـەتی کوردیـەوە، هەسـتان بەدروسـتکردنی ئـاڵای کـورد بەقورقوشـمو دابەشـکردنی بەسـەر خوێنـدکارانی کـورددا، خوێندکارانیش بەنزیکەیی لەژێر کڵاوی چاکەتەکانیاندا ئاڵایەکی کوردیان دەشاردەوە، بۆئەوەی بیسـەلمێنن‌و شانازی بـەئینتیمای نەتـەوەیی خۆیانـەوە بکـەن.(54) دروشـمی ئـەو رێکخـراوە خـۆی لـەکتێبێکی کـراوەدا دەبینیەوە، کە لەنێوانیدا پێنوسێك خـۆرێکی پرشـنگدار لـەدورەوە رونـاکی دەکـردەوەو بەڵگەنامـەکانی رێکخراوەکەی پێ مۆر دەکرا.
لەسـەرەتای سـاڵی 1948 رێکخراوەکـە هـەر کوردێـك بەباشـی خوێندنـەوەو نوسـینی بزانیبایـە وەك ئەنـدام وەریدەگرت، بـەوەش بەنزیکـەیی زۆربـەی رونـاکبیران‌و مامۆسـتایانی گـەنجی ناوچـەی(جبـل الاكـراد)ی لـەخۆگرت، بەتایبـەت دوای ئـەوەی تـوانرا پەیوەنـدی بەئەنـدامانی رێکخراوەکـەوە لەناوچـەی جبـل الاكـراد بکرێـت، بەتایبـەت رەشـید حـەمۆو ئیبـراهیم قـادرو رەشید عەبدورەحمان‌و عەولی خۆجـە.(55) هـەروەها شـەوکەت‌و خـەلیل محەمـەد، کەرەگـەزی سـەرکردایەتیان لەرێکخراوەکـەدا(دەسـتەی کـارگێری) پێکهێنـابو، هـەروەك رێکخراوەکـە خۆیشـی لـەنێوان کوردانی شاری حەلەبدا چالاك بو.

زیادبونی هەستی نەتەوایەتی‌و دزەکردنی هەواڵی بزوتنەوە نەتەوەییە کوردیە هەڵکشاوەکانی عێراق‌و ئێران‌و بەتایبەت هەواڵی پێکهێنانی کۆماری کوردی مهابادو بەرزبونەوەی چالاکی رێکخراوە سەربەخۆ خوازەکان،(56) ئەمانە فاکتەری یارمەتیدەرو هاندەربون بۆبڵاوبونەوەو بوژانەوەی کۆڕو کۆبونەوەو رێکخراوە نەتەوەییە کوردیەکانی سوریا. بەرنامەی ئەو رێکخراوانە لەبنەڕەتدا تەرکیزی دەخستە سەر فێربونی زمانی کوردی‌و پەرەپێدان‌و وتنەوەی مێژوی کوردو راپەڕینەکان‌و داواکاری بۆپێکهێنانی دەوڵەتێکی کوردی سەربەخۆ.

بابەتەکانی وانەوتنەوە لەو کۆمەڵانەدا گوزارشت بو لەچەند بڵاوکراوەیەکی زمانەوانی‌و وێژەیی‌و سیاسی. هەمیشەش ئەو کۆمەڵانە لەگەڵ سەرۆکی هۆزەکان‌و سەرکردە ئاینیە دەمارگیرەکاندا بەریەکدەکەوتن، ئەوەش بەهۆی ناکۆکی‌و دژایەتی سروشتی ئەوانە لەگەڵ بەرنامە نەتەوەییەکەدا.(57) سەرەڕای هەوڵی بەدرخانیەکان‌و هاورێکانیان بۆچنگخستن‌و راکێشانی ئەو کەسایەتیانە(ئاغا، بەگ، مەلا، شێخ)، یان لانیکەم بێلایەنکردنیان، بۆئەوەی نەبنە رێگر لەبەردەم بزوتنەوەی نەتەوایەتیدا.(58).

# پەراوێزو سەرچاوەکان

1- جلال الطالباني: كردستان والحركة القومية الكردية، دار الطليعه، بيروت، 1971. ص(100)، هەروەها بگەڕێرەوە بۆ لطیف برزنجي: شێخ محمود، وتارێك: بەزمانی کوردی لەگۆڤاری(کاروان)، ژمارە(20)، بەغدا، کانونی یەکەمی 1984.
2- عبدالرحمن قاسملو، فی کتاب جماعی، مرجع مذکور، ص(173).
3- مێژوی ئەو یادداشتنامەیەو جگە لەویش راستیەکان، دەیسەلمێنن، کە(منذر الموصلي) هەڵەی کردوە، کاتێك لەکتێبە ناوبراوەکەیدا وادەڵێ، ص(83)، بەڵام لەچەرخی نوێدا بونی کورد لەباکوری سوریا لەساڵی(1926)دا بوە، بە تەواوەتی.
4- کریس کۆچێرا، سەرچاوەی ناوبراو، ص(33-43).
5- رمي شيخو الفرحة: دراسات اشتراكية، مجلة الحزب الشيوعي السوري، عدد(50)، عام 1985، ص(100).
6- زۆرینەی ئاغاکانی عەشیرەتی میللی کوردیو خێڵە نیشتەجێبوەکانی لەباکوری رۆژئاوای حەلەب لایەنگری ئیبراهیم هەنانو بون.
7- جريدة تشرين اليومية السورية، عدد(2830) الصادرة فی(17 نیسان 1984).
8- بەرێکوپێکی نازانین ئەو بەڵێنانە کامەیە، کە هەنانو لەم بەیاننامەیەدا مەبەستیەتی.

9- جريده تشرين، العدد المذكور سابقاً.
10- جريدة تشرين، العدد المذكور سابقاً.
11- بزوتنەوەی چەكداری موریدیەكان درێژبوەوەی شێوازەكەی هەنانوە لەخەباتی چەكداریدا.
12- كریس كۆچێرا، سەرچاوەی ناوبراو، ص(85).
13- المصدر نفسه، ص(89).
14- ئەوە جۆرێك بوە لەشتراتیژیەتی یاریكردن لەسەر دو پەت.
15- هەروەها لەگەڵیشیدا هەردو جوتیار حەسەن مادۆو خەلەف بادی دەستگیر كرانو فەرەنسیەكان دیسان ئەحمەد یوسف ئاغاشیان دەستگیركرد.
16- رمي شيخو الفرحة، العدد المذكور من الدراسات الاشتراكية، ص(107).
17- كریس كۆچێرا، المرجع المذكور، ص(88)، تێبینی دەكرێ، كەسنوری نێوان سوریاو توركیا دواتر دانەنراوەو قامیشلیش دواتر نەبوە بەشار.
18- فرج نمر: الاكراد تحت الانتداب الفرنسي، الجزء الأول، مجلة (صوت كوردستان)، العدد(19) عام 1995.
19- بێگومان حاجۆ لەگەڵ فەرەنسیەكاندا مامەڵەی دەكرد لەسەر بنەمای داواكاری كۆمەڵەی خۆیبون ساڵی(1927-1931).

20- كریس كۆچێرا: سەرچاوەی پێشو، بەڵام كۆمەڵەی خۆیبون مایەوەو سەركردایەتی شۆرشی

ئــاگری کــرد، تــاوەکو ســاڵی(1931)، کــە لــەروی ســەربازیەوە ئیحســان نــوری پاشــا فەرماندەیــەتی دەکرد. باڵوێزی فەرەنسا(رۆجی لسیکو) لەپوختەی توێژینەوەیەکیدا دەربارەی کرداغ دەڵێت:"لەترسی ئیزعاج بونی تورکان هەرگیز رێگەمان بەبڵاوبونەوەی چالاکی نەتەوەپەروەرانی کورد بەئازادی لەسوریا نەداوە". لا(25)، (بلسم کامل) سەرجەمی توێژینەوەکەی(لیسیکۆ)ی لەفەرەنسیەوە بۆزمانی عەرەبی وەرگێڕاوەو لێدوانی خۆیشی لەسەر نوسیوەو لەبەیروت ساڵی(1989) بڵاوی کردۆتەوە لەژێر ناونیشانی(شۆڕشی چیای کوردان دژی کۆلۆنیالیزمی فەرەنسا لەسوریا)، هەروەها پڕوانە فرج نمر: الأكراد تحت الأنتداب الفرنسي، الجزء الثاني، مجلة(صوت كوردستان)، عدد(20) لعام 1995.

21- دراسات اشتراكية، العدد(1) لعام 1984، ص(184)، مقال بعنوان(دخول الأفكار الشيوعية الى جبل الكراد، منطقة عفرين)، القسم الثانى.

22- بەتایبەت ئەو جوتیارانە بەهۆی قەرزی خاوەن زەویەکانیانەوە بارگران بو بون.

23- منذر الموصلي،(المرجع المذكور، ص 469).

24- رمو شيخو الفرحة، دراسات اشتراكية، العدد المذكور، ص(111).

25- ئەگەرچی موریدیەکان لەچونە نێو پێشبڕکێی پەرلەمانیەوە دودڵ نەبون، بەجۆرێك بەهۆی ئەمانەوە کاندیدەکەیان(حەسەن عەونی) وەك ئەندام پەرلەمان

لەپەرلەمانی سوریا ساڵی(1936) دژی پاڵێوراو (کور رەشید) سەرکەوت، بەڵام بزوتنەوەی موریدین شێوازی خەباتی چەکداری بەشێوەیەکی بنەڕەتی لەکاری سیاسی لەمیانەی ساڵانی(1933-1938) گرتەبەر. هەریەکە لە شێخ حەنیف (وەك فەرماندەیەکی رۆحی)و عەلی غالیب(وەك بەڕێوەبەری کاروباری دارایی) یارمەتی(ئیبراهیم خەلیل)یان دا، کە لەتورکیا نیشتەجێ بو. لەمیانەی ئەو ماوەیەدا موریدیەکان توانیان بەسەر هەردو شاری ئوروزو بلالیکو و زۆرینەی گوندەکانی دەوروبەریدا زاڵبین، رۆڵی رەشید ئابو عەسکەری لەبڵاوکردنەوەی دەسەڵاتو نفوزی بزوتنەوەکەدا دیارە. بەڵام لەساڵی(1938) هەرسێ سەرکردەی ناوبراو دەستگیرکران، بەڵام فەرەنسا لەهەوڵێکدا خواردنی پاروەکە رێگەی بەردەمی چۆڵکردن. لەمانگی شوباتی(1938)دا ئیبراهیم حەلیل بۆناوچەی(جبل الأكراد) گەڕایەوەو ناوچەی موریدیەکان فراوان بو. هەروەها چالاکیشیان زیادی کرد. بۆیە شێخ لەناوچەی(میدانکی) لەرۆژی(1938/9/30) تیرۆرکراو جەمیل ئاغای ئێزیدی لەو هەوڵی تیرۆرکردنە رزگاری بو.

هەروەها هەوڵی هاوشێوە بۆتیرۆرکردنی هەریەکە لەفایق ئاغا، سیدو دیکو و کوشتنی ژمارەیەك لەئاغاکان هەبو. جەنگێکی گەورە لەنێوان موریدیەکانو فەرەنسیەکان لەمانگی کانونی دوەمی

ســاڵی(1939)دا لــەنزیك ئــوروز رویــداو موریدیــەكان توانیان پاسگەی زیتونـك لـەرۆژی(15)ی كـانونی دوەم داگیـــر بكـــەن‌و لـــەرۆژی(29ی هـــەمان مانـــگ) پاســـگەیەكی تریـــان لـــە كوبـــاس داگیركـــردو لـــــــەرۆژی(24)ی هـــــــەمان مانگیشـــــــــدا پێشــتر(قسـطل)یشـیان داگیركردبـو. بـەڵام سـوپای فەرەنسا هێرشێكی گەورەیان لەرۆژی(28ی شـوباتی 1939) دەستپێكردو توانیان شێخ حەنیف بگرن.

موریدیـەكان توانیـان لـەكۆتایی مـانگی ئایـاری(1940) چـالاكی خۆیـان بگێڕنـەوە، بــەڵام رێكــەوتنی نێــوان فەرەنســـیەكان‌و توركـــان بزوتنەوەكـــەی لـــەڕوی سەربازیەوە ماندو كرد. بگەڕێرەوە بۆ(رۆجیە لیسـیكو)، توێژینەوەیــەك دەربــارەی موریدیــەكان لــەكرداغ، بــە زمانی فەرەنسی، كە(بلسم كامل) بۆزمانی عەرەبی وەریگێـڕاوەو لێـدوانی لەســەر نوســیوە. ســەرچاوەی پێشـــو، هـــەروەها ڕوانـــە زنـــار ســـلوپی: لـــەپێناوی كوردستاندا، یادداشت، وەرگێڕانی(ر.عـەلی)، خانـەی نوسـەر، لوبنان، 1987، هەروەها بگەڕێرەوە بۆمحەمەد مــەلا ئەحمــەد: خۆیبــون، وەرگێڕانــی(كــەجا كــورد)، دیمەشـــق، 1993، بـــەزمانی كـــوردی. هـــەروەها بگــەڕێرەوە بــۆ یاداشــتەكانی جــەنراڵ ئیحســان نــوری پاشا(راپەڕینی ئاگری)، وەرگێڕانی(سـەلاح بـەرواری)، 1990، لوبنان.

26- كریس كۆچێرا، سەرچاوەی پێشو، لا(100).

27- ئـەو راپەڕینـە لەگۆرانیـەکی علیکـی بگـی دا، کـە گـــۆرانیبێژی میللـــی (رەفعـــەت داری) وتویـــەتی، بەرجەستە بوە.
(28+29)- رمـــو شـــیخو الفرحـــە: مجلـــە(دراســـات اشــتراكية)، عــدد المـذكور، ص(108-110)، لـە نێـوان كـــــوژراوه ناســــــراوەكاندا(هەســــۆ روتــــكو كۆمەڵەكـەی)هــەبون، کــە لــەکاتی بۆردومــانکردنی گونــدی(تــل حــبش) لەلایــەن هێــزی ئاســمانی فەرەنساوە شەهید کران.
(30+31)- المصدر نفسه، ص109.
32- د.كامـــەران عـــالی بـــەدرخان ئـــەو راســـتیەی تێبینیکردوەو لەوتارێکدا بەناونیشانی(قۆناغ-المرحلـە)، کەبـــەزمانی کـــوردی بڵاوکراوەتـــەوە لـــەژمارە(19ی رۆژنامەی رۆژی نوێ)و لەرۆژی(1943/5/3)دا دەرچـوە، باسیکردوە.
33- رۆژنامەی(رۆژی نوێ)و گۆڤـاری(رونـاهی)زۆربـەی لاپـــــەڕەکانیان بۆپیاهەڵـــــدانی هاوپـــــەیمانانو بڵاوکردنەوەی پروپاگەندەکانیان تەرخانکرابو.
34- خالد بكداش، مجلـة( الـنهج)، العـدد(2)، تشـرين الثانی 1983، ص101.
35- مجلەالعـــدد، العـــدد(6)، كـــانون الثـــانی 1984، ص173.
36- جگــە لــەحزبی شــیوعی ســوری، کــەخاوەنی ســـتراکچەری رێکخراوەیـــی پتـــەوو یـــەکێتی هـــزری سەپێنراو بو.

37- حزبی شـیوعی سـوریا پەرۆشـی ڕێكەوتننامـەی 1963 بـــو، چونكــــە لەوكاتـــەدا حزبـــی شــــیوعی فەرەنسی(لیون بلون) لەدەسەڵاتو فەرمانڕەواییدا بو.
38- دراسة تاريخية تحليلية موجزة لنضال حزب البعث من(1943-1971). صادرة عـن القيـادة القوميـة لحـزب البعث العربي الاشتراكى، ص10.
39- دراسة اولية حول نقد تجربـة الحـزب، مقـررة فـى المـــؤتمر القـــومي الحـــادي عشــــر لحـــزب البعـــث الديمقراطى الاشتراكي العربي، ص30-40.
40- دراسة تاريخية، المرجع الذكور، ص14.
41+42+43- المصدر نفسه، ص21-22.
44- وەك خێڵـــی بـــەرازی، كـــە ڕۆڵێكـــی گرنكيـــان لەسـەركردايەتی كوتلـەی نيشـتمانيدا گێڕاو پردێكـی سياســـان لــەنێوان بزوتنــەوەی موريــدين لــە(جبــل الاكــراد)و كوتلــەی نيشـــتمانيدا پێكهێنــا. هــەروەها ڕەشـــيد كوێخـــا كـــە ســـەركردايەتی (حزبـــی گـــەلی) دەكرد.
45- لـــەبڕياری ليژنـــەی ناوەنـــدی حزبـــی شــــيوعی ســوری، كــە لــەكۆتايی حــوزەيرانی 1984 دا دەرچــوە، هـــاتبو:"دروشــــمی يـــەكێتی نەتـــەوەی عــــەرەب لەمەســـەلەی نەتەوايەتيــدا، تــاوەكو ئێســـتاش لـــەو دروشمە گرنگانەی حزبی شيوعيە ".
46- لەهەنــدێ لــەو ڕۆژنامــە كورديانــەی، كــە لــەو ماوەيــەدا دەرچــون، دەگێڕنــەوە پەيوەنديــەكی بــاش لــەنێوان كــوردانو هەنــدێ ســـەركردەی ســـەربازی

فەرەنسـادا هـەبوە، بۆنمونـە لـەگۆڤاری(رونـاهی)، ژمارە(1)، کـە لـەرۆژی(1ی نیسـانی 1942) دەرچـوە، نوسـەرێك دەڵێت:" كۆمنـدان(كەجـەنراڵێكی سـەربازی فەرەنسـی بـوە-وەرگێـڕ-) كـوردانی خۆشویسـتوەو لـەكاروباریان شـارەزا بـوە، بەهـەمان شـێوە كـوردانی ناوچـەی جـەزیرەش ئـەویان خۆشویسـتوە. لـەژمارە(2)ی هـەمان گۆڤاریشـدا، كـە لـەرۆژی(1ی ئایـاری 1942) دەرچـوە، نوسـەرێك ستایشـی جەنراڵ(كولی) كردوە.

47- مجلـه الـنهج، العـدد(1)، كـانون الثـاني 1981، ص97.

48- مجلة دراسات اشتراكية، العدد المذكور، ص102-106، فرج نمر: الاكراد تحـت الأنتـداب الفرنسـي، ج3، صوت كوردستان، العدد(29)، 1996.

49- اوصمان صبري- مقال منشور باللغة الكرديـة فـی العدد(18) من مجلـة(روناهی) الصادرة فـی(1 ایلـول 1943).

50- میری شاعیرانی کـورد(ئەحمـەدی خـانی(1606-1650) لەقەسـیدە شـیعریەكەیدا(مـەمو زیـن) كوردسـتان وەك زیندانیـەك دەچوێنێـتو ئـامرازو كۆششـی پێویسـت بۆرزگاركردنی روندەكاتـەوەو كـورد بۆئـازادیو سـەربەسـتیو پێكهێنـانی نیشـتمانێكی نەتەوەیی سـەربەخۆ بانگ دەكات.

51- بۆپـەیگیری لەسـەر سـەرەتاكانی راپـەڕینی نەتـەوەیی رێكخـراو لای كـوردان، پروانـە كتێبەكـەی

جەلیلی جەلیل: راپەڕینی روناکبیریو سیاسی لای کوردان لەکۆتایی سەدەی 19و سەرەتای سەدەی 20، وەرگێرانی(عەلی شیر)، سوید، 1985، لەبڵاوکراوەکانی زینانۆ.
52- محەمەد ئەمین زەکی بەگ دانەری کتێبی(خولاسەی مێژوی کوردو کوردستان)، وتەکەی بەمە دەستپێدەکات:" کاتێك وشەی عوسمانی بۆئەوەی جێگەی هەردو وشەی تورکیو تۆرانی بگرێتەوە دورخرایەوە، بەشێوەیەکی سروشتی هەستم بەشعوری بەهێزی نەتەوایەتی سەربەخۆی خۆم لەنەتەوەی تورکان کرد".
53- اوصمان صبری، وتارێکی بەزمانی کوردی نوسراو بەبۆنەی کۆچی دوایی ئەحمەد باراقی لەرۆژی(1943/8/1) لەدیمەشق نوسیوە، کە لەگۆڤاری(روناهی) ژمارە(18)دا بڵاوکراوەتەوەو گۆڤارەکە لەرۆژی(1943/9/1)دا دەرچوە.
54- دراسات اشتراکیە، ژمارەی ساڵی 1984، ل(185-186).
55- هەمان سەرچاوە.
56- وەك حزبی رزگاری کورد، کەداوای یەکێتیو سەربەخۆیی تەواوی کوردستانو ئازادی گەلی کوردی دەکرد. بگەڕێرەوە بۆبەیاننامەی ئەم حزبە، کەپێشکەشی نەتەوە یەکگرتوەکانی کردوەو بەشێکی لەرۆژنامەی(النهار)ی لوبنانی،

ژمارە(2304)دا بڵاوکراوەتەوەو لـەرۆژی(1946/2/17)دا دەرچوە.
57- ئـــەوە لەئـــەدەبیاتی بڵاوکـــراوەی رۆژنامـــە کوردیـــەکانی ئـــەو ماوەیـــەدا روندەبێتـــەوە، بۆنمونـــە هەریەکـە لەمـەلاو ئاغـای گونـدی(تـل ایلـول)رێگریـان لەلاوان دەکرد لەوەی فێری زمانی کـوردی بـبن، بۆیـە یەکێك لەگەنجەکان، کەبریتی بـو لەجـەنکباز مـەحمود جـــەبری، ناچـــاربو لەگوندەکـــە (بـــەبیانوی فێربـــونی شـــەریعەتو خوێنـــدنی ئاینـــەوە)و پەیوەنـــدی کـــردن بەکەسایەتیە نەتەوەییەکانی کوردەوە لـەعامودا، کـۆچ بکات. بـۆ ئـەم روداوە بگـەڕێرەوە بۆگۆڤـاری(رونـاهی)، ژمارە(7)، کەلەرۆژی(1ی تشـرینی یەکـەمی 1942)دا دەرچـوە. هـەروەها بگـەڕێرەوە بۆنامەیـەکی یوسـف حاجی حرسان:" نەدەبو بزانم، کەئیزرائیلیش دیسـان دوژمنـــــی کـــــوردە"، کـــــە لـــــەژمارە(12)ی گۆڤـــــاری(رونـــــاهی)دا بڵاوکراوەتـــــەوەو لـەرۆژی(1943/5/1)دا دەرچـوە. ئەمـەش مانـای ئـەوە نیـــە، کەهـــەمو ئاغـــاو شـــێخەکان دژی بیرۆکـــەی نەتەوەیی بوبن، بەڵکو بەشێکی گەورە لەوانە لەریزی پێشـەوەو پێشڕەوی کەسایەتیە نەتەوەییـەکانی کـورد بـــون، لەمـــەلاو شـــێخەکان نمونـــەی جگـــەرخوێنو حەســـەن هۆشـــیارو ئەحمـــەد نـــامیو مـــەلا عەلی(لـەتوبز). لـەئاغاو بەگـەکانیش نمونـەی حـاجۆو شـوکری ئاغاو ئەمین بریخانیو عـارف بـەگ عـەباسو عەفـدی ئاغـا خلـۆو بـوژان شـاهین بـەگو براکـەی

مستەفا شاهین بەگو جگەلەوانیش، هەمو ئەمانە لەنێو بزوتنەوەی نیشتمانی کوردیدا بون.

58- لەزۆربەی وتاری رۆژنامە کوردیەکانی ئەو ماوەیەدا تێبینی ئەو دەمارگیریە تەوفیقیە لەنێوان کەسایەتیە نەتەوەییەکانو ئەوانەی خاوەنی ئاراستەی موحافیزکارانە بون لەنمونەی ئاغاو کەسایەتیە ئیسلامیەکان دەکەین. لەوتارێکی بڵاوکراوەی ژمارە(5)ی گۆڤاری(روناهی)، کە لەرۆژی(1942/8/1)دا دەرچوە، د.جەلادەت بەدرخان دەیەوێت ئاغاو بەگو پاشاو میرانی کورد قەناعەت پێبکات بەپێویستی فێربونو فێرکردنی زمانی کوردیو سوربون لەسەر بڵاوکردنەوەی گیانی نەتەوایەتیو ئیغراکردنیان بەوەی ئەوە دەسەڵاتو نفوزو خۆشەویستیو رێزیان لەنێوان گەلدا زۆر دەکات.

لەلایەکیترەوە کەسایەتیە نەتەوەییەکانی کورد هەمو دەرفەتێکیان دەقۆزتەوە، بۆئەوەی بتوانن رێکەوتن لەگەڵ سەرکردە کلاسیکیەکاندا وەیدیێنن. بۆنمونە حەسەن هۆشیار، کەیەکێك بو لەکەسایەتیە نەتەوەییە ناسراوەکان، لەنامەیەکی بڵاوکراوەیدا لەگۆڤاری (روناهی)ی ژمارە(16)، کە لەمانگی تەموزی 1943دا دەرچوە، بەشداری خۆیمان لەو ئاهەنگەدا بۆروندەکاتەوە، کەسەعید ئاغای دەقوری، کە بەبۆنەی سەرکەوتنەکانی ئینگلیزەوە سازیکردبو. بۆیە وادەردەکەوێت نوسەری نامەکە خۆشحاڵ بوبێت بەو ئاهەنگەو شانازی پێوەکرد بێتو پشتگیریشی

لێکردوە، بەدڵنیاییەوە حەسەن هۆشـیار(1907-1985) گوزراشـتکردنی لەهەسـتی نەتەوایەتی‌و نیشـتمانی‌و ناهەمواریـــــەکانی نەتەوەکـــــەی لەنامەکەیـــــدا لەبیرنـــەکردوە، بـــەڵام نـــازانین ئـــەم کەســـایەتیە نیشـــــتمانپەروەرە لەوکاتـــەدا لەگـــەڵ ئاغاکانـــــدا شـوێنکەوتە یاخود شـوێنکەوتو یان هاوپەیمان بـوە یـان نـــا؟ حەســـەن هۆشـــیار لەشـــاری قامیشـــلی ســـاڵی(1985) لەتەمـــەنی 78 ســـاڵیدا مـــردوە.
بگـــەڕێرەوە بـــۆکتێبی وتـــەکانی حەســـەن هۆشـــیار بـــەزمانی کـوردی، لـــەئامادەکردنی(بلســـم قاســـم)، چـــاپی دوەم. هـــەروەها بگـــەڕێرەوە بۆبیرەوەریـــەکانی حەسـەن هۆشـیار بـەزمانی کـوردی، 500 لاپەڕەیـە، پێشـکەشـکردنی(دلاوەر زەنگی)، چاپخانـەی ئـەمیراڵ، لوبنان، 1993.




لــە چەپــەوە: مســتەفا محەمــەد و حەمیــد شــێخۆ، ئەندامانی بزوتنەوەی موریدەکان



الجمهورية العربية السورية
وزارة الداخلية
مديرية الشؤون المدنية بمحافظة الحسكة

الصورة

غير صالحة لوثائق السفر وخارج القطر

صورة قيد فردي خاصة بالمسجلين في سجلات اجانب محافظة الحسكة

الاسم ........ النسبة ........ اسم الاب ........ اسم الام ........
محل وتاريخ الولادة ........ الجنس ........ الوضعية العائلية ........
محل ورقم القيد ........ تاريخ التسجيل ........

لم يرد المذكور قيد في سجلات العرب السوريين بمحافظة الحسكة نتيجة احصاء عام ١٩٦٢ ، وبناء على الطلب اعطيت صورة القيد اعلاه المدون في سجلات اجانب تلك المحافظة .

في / / ١٤٠ (هـ) و / / ١٩ (م)

اسم وتوقيع المراقب : ........ امين السجل المدني في ........

سـورەت قـەیـدی کەســی ئەوانـەی کـە لـە تۆمـاری بیانیەکانی پارێزگای حەسەکەن




ناسنامەی تێکۆشەر(رەشید ئیبۆ) لە کەسایەتیە دەرکەوتوەکانی بزوتنەوەی موریدەکان




شارەدێی بلبل




تێكۆشـەر(حاجی حەنان شـێخ ئیسـماعیل زادە)




شێخ حەنیف عەزیز، رابەری رۆحی بزوتنەوەی
موریدین و جێگری شێخ ئیبراهیم خەلیل




شێخ ئیبراهیم خەلیل سەرۆکی بزوتنەوەی موریدین




محەمەد مەلا نەعسان، یەکێك لە فەلاماندەکانی بزوتنەوەی موریدین




ئەو تێکوشۆشەرانەی لە دژی داگیرکاری فەرەنسا ڕاپەڕین، لە ڕاستەوە: ئەحمەد ڕۆتۆ، عفرین، شێخ ساڵح العلی، سەعدوڵڵا، یوسف عەزەمە، شێخ عەبدی خۆجە/ عفرین- میدانکی- ئیبراهیم هەنانو- مستەفا شێخ حسین




تێکۆشـەر: سـیدۆ دیکۆ




تێکۆشـەر: مەحۆ ئیبۆ شـاشـۆ

تێبینی:
و.ك- وەرگێڕی كوردی
ل- لاپەڕە
ص- صفحة
ط- طبعه
ژ- ژمارە
مج- مجلد
ج- جلد

## بەرهەمە بڵاوكراوەكانی وەرگێڕ

1. بزوتنەوەی گەلانی ناعەرەب (شعوبیەت) لەئیسلامدا، لێكۆڵینەوە، 2004، بڵاوكراوەكانی خانەی چاپو بڵاوكردنەوەی وەزارەتی رۆشنبیریی سلێمانی.

2. مێــژووی پێکهــاتن‌و پەرەســەندنی بیــری تــۆرانیزم، لێکۆڵینــەوە، 2008، بڵاوکراوەکــانی پــرۆژەی کتێبــی گۆڤاری(کۆچ).
3. موقەدەس‌و کولتور، لێکۆڵینەوە، 2008، بڵاوکراوەکانی دەزگای چاپ‌و پەخشی سەردەم.
4. گوتاری ئیسلامی‌و گرفتی ئۆپۆزیسیۆنی سیاسی، لێکۆڵینەوەو وتوێژ، 2009، بڵاوکراوەکانی خانەی ڕەهەند.
5. ئازادی رادەربڕین لـەنێوان ئـاین‌و ئازادیـدا، لێکۆڵینـەوە، 2009، بڵاوکراوەکانی چاپخانەی سایە، سلێمانی.
6. دەربــارەی زانســتی مێــژوو، فەلســەفەی مێــژوو، نوســین‌و ئامـادەکردن‌و وەرگێـڕان، 2009، بڵاوکراوەکـانی چاپخانەی ڕێنما، سلێمانی.
7. عوسمانییەکان، چاپی یەکـەم‌و دووەم، 2008و2009، وەرگێڕان، بڵاوکراوەکانی چاپخانەی ڕێنما، سلێمانی.
8. سیستمی پـەروەردەیـی لـەوڵاتانی ئەسـکەندەناڤیا، ســـوید، نـــەرویژ، دانیمـــارك، وەرگێـــڕان، 2009، بڵاوکراوەکانی چاپخانەی سایە، سلێمانی.
9. چــەردەیــەك لــەکولتوری دیموکراســیی ئــەمریکا، وەرگێڕان بەهاوبەشی لەگەڵ(حەسەن حسێن)، 2009، بڵاوکراوەکـانی پـرۆژەی(60)کتێـب دەربـارەی پێکهاتـە فیکرییەکانی دیموکراسی.
10. دەربـــارەی ئـــەمریکا، دەســـتوری ویلایەتـــە یەکگرتوەکانی ئەمریکا، سەرنج‌و راڤـەرکارییی، وەرگێـڕان بەهاوبەشـــی لەگـــەڵ(حەســـەن حســـێن)، 2010، بڵاوکراوەکانی چاپخانەی چوارچرا، سلێمانی.

11. کـــوردان لـــەژێر داگیرکـــاری فەرەنســـا، وەرگێـــڕان، بڵاوکراوەکانی چاپخانەی چوارچرا، سلێمانی، 2010.

## ئەو بەرهەمانەی لەژێر چاپدان

1. ژیانی سیاسی لەباشوری کوردستان(1975-1991)، ســەرهەڵــدانی رەوتــی سۆسیالیســتیو دروســتبونی حزبی سۆسیالیستی کوردستان بەنمونـە، لێکۆڵینـەوەو تێزی ماستەرنامە.
2. کـــوردان لـــەژێر داگیرکـــاریی فەرەنســـا، وەرگێـــڕان لەعەرەبیەوە.
3. دەربـــارەی جوڵانـــەوەی کـــورد لەبـــەڵگەنامـــەکانی فەرەنسا، وەرگێڕان لەعەرەبیەوە.
4. لەبارەی رۆژهەڵاتناسییو کوردناسیەوە، ئامادەکردن.